# پێشبار

## کۆکردنەوە و شیکردنەوەی چەند تێکستێکی گۆرانیی فۆلکلۆری کوردی





ئامادەکردن: زیاد محەممەد ئەمین




ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد

# پێشبار

کۆکردنەوە و شیکردنەوەی چەند
تێکستێکی گۆرانیی فۆلکلۆری کوردی

ئامادەکردن
زیاد محەممەد ئەمین



ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد- سلێمانی

ناوی کتێب: پێشبار

ئامادەکردن: زیاد محەممەد ئەمین

پێداچوونەوە: بوار نوورەدین- ئارارات ئەحمەد

ژمارەی بڵاوکراوە: ٢٢٧ی ئنستیتیوت

چاپی یەکەم: چاپخانەی کارۆ- سلێمانی

تیراژ: ٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان،
ژمارەی سپاردنی ١٧٩٦ی ساڵی ٢٠١٧ی پێ دراوە.

---

ناونیشان: عێراق ـ سلێمانی

زۆنی: ١ / گەڕەکی: ٢ / کۆڵانی: ٣٤ / خانووی: ٢

Tel: 00964 53 320 4232
053 321 0157
062 761 2253
www.khi.krd
khip_2003@hotmail.com




ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد وەك دەزگایەکی تایبەتمەند بە کۆکردنەوە، ئەرشیڤکردن، گەشەپێدان و بڵاوکردنەوەی کەلەپوور و فۆلکلۆری کوردستان دامەزراوە. بەشی (چاپ و لێکۆڵینەوە)ی ئەم دەزگایە، هەر لە سەرەتای دەست بەکاربوونیەوە، چوارچێوەیەکی زانستیی و جێگیری بۆ کارەکانی دەستنیشان کردووە و هەوڵی داوە بەرهەمەکانی وەك سەرچاوەیەکی زانستی لە ئەرشیڤی کتێبخانەی کوردیدا، کەڵك بە توێژەران و لێکۆڵەران بگەیەنێت. بۆ ئەم مەبەستە، بە هەماهەنگی لەگەڵ کەسایەتیی و شارەزایانی بواری فەرهەنگی کورد و کوردستان، پرۆژەکانی جێبەجێ دەکات، لەبەر ئەمە، ئەو نووسراو و لێکۆڵینەوانەشی کە لەلایەن نووسەرانی ترەوە پێی دەگات، بە هەمان شێوەی پرۆژەکانی خۆی، کاری زانستیی و هونەرییان بۆ دەکات و بەچاپیان دەگەیەنێت.

ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد




# ناوەرۆك

کەس بە ئەلفازم نەڵێ خۆ کوردییە، خۆکردییە،

هەر کەسێ نادان نەبێ، خۆی تالیبی مەعنا دەکا

- نالی -

# پێشەکی

هەروەك لەسەر بەرگی ناوەوەی کتێبەکانی شادڕەوان مامۆستا زیاد نووسراوە، کارمان لەسەر زۆربەیان کردووە و دەستنووسی ئەم کتێبەش بە هەمان شێوە، بە ئێمە سپێردراوە. بەرپرسیارێتییەکی لەم جۆرەش، ئاسان نییە و ئەرکی خۆی هەیە، لەم ئەرکەشدا کاك ئارارات ئەحمەدی هاوڕێم و دۆستی م.زیادیش، هاوکاریی زۆری کردووم.

دەستنووسی پێشبار، سەرچاوەی بەشێکی ئەو تێکستە فۆلکلۆری و میللییانە بووە، کە لە کتێبەکانی پێشتری مامۆستادا بڵاوکراونەتەوە، دەقەکانیشی بە قەڵەمی مەرەکەب تێدا تۆمارکردوون. لەم ساڵانەدا، ڕەشنووسەکەی تەڕ و لەکەڵك بووە. شادڕەوان، دووبارە دەقەکانی نووسیوەتەوە و زۆریش پێیانەوە ماندووە بووە.

ئەم کتێبە، کۆکردنەوە و شیکردنەوەی چەند بەیتێك، یان چەند جۆرێکی گۆرانیی کوردیین، هەروەك خۆی لە لاپەڕەکانی دواتردا، ئاماژەی پێ کردووە، کارەکەی لە کۆکردنەوەی فۆلکلۆریش ئەولاترە، بە پێی توانا و سەلیقە و شارەزایی خۆی، هەوڵی ساغکردنەوە و لێکدانەوەی، کۆمەڵێك وشە و دەستەواژەی نێو دەقە فۆلکلۆرییەکانیشی داوە.

ئەم پێداچوونەوەیە، لەگەڵ ئەو کتێبانەی مامۆستادا جیاوازە، کە پێشتر پێیاندا چووینەتەوە و ڕەنگبە دەستکاری و گۆڕانکاریی زۆریشمان تێدا کردبن. جیاوازییەکە لە دوو خاڵدا دەبینین. یەکەم: خۆی لە ژیاندا بووە، کە دەستنووسەکانی بۆ هێناوین، دوای تایپ و ئامادەکردن، چەند جارێك سەردانی کردووین و هەرچی سەرنج و

تێبینییەکانە، بەیەکەوە یەکلاییمان کردوونەتەوە، کە بێگومان و بەداخەوە، دۆخی ئێستای ئەم کتێبە وا نەبووە.

دووەم: لە (لاپەڕە ٦٠)ی ئەم کتێبەدا، باسی دەستکاریکردنی دەق و بۆچوونی ئەدەبی کردووە و پێی باش نەبووە، کەسێك بە بێ شارەزایی و ئاگاداریی تەواو، دەستکاری نووسینی کەسێکی دی بکات.

م.زیاد، ئاماژەی بە سەرچاوەی زۆربەی ئەو دەقانە کردووە، کە کەڵکی لێ وەرگرتوون، وەك: کتێب، کاسێت، کەسایەتی و کەسی ئاسایی. بەڵام ناسنامەی هەندێ کتێبی بە تەواوی نەنووسیوە، لە هەندێ شوێنیشدا، تەنها (سەرچاوەی پێشوو)ی بۆ نووسیونەتەوە، زۆربەی سەرچاوەکانمان دۆزیوەتەوە و ناسنامەمان بۆ ئامادە کردوون. لەگەڵ ئەمەشدا، دۆزینەوەی شوێنی هەندێ دێڕی شیعریی ئاسان نەبووە و دەبوایە بەسەر هەموو ئەو کتێبانەدا بچینەوە و ئەو هۆنراوە و دێڕە شیعرییانە بدۆزینەوە، کە ئەو لێرەدا بەکاریهێناون.

دوای خوێندنەوەی کتێبەکە، هەستمان کرد، م.زیاد بە مەبەستەوە، ئەم کتێبەی بە شێوازێکی تایبەت نووسیوە و هەست و بۆچوونەکانی دەبڕیوە، کە لە کتێبەکانی پێشتریدا، کەمتر هەست بەو جۆرە شێوازەی نووسین و دەربڕینی ئەو کراوە. ئەگەر دەستکاریمان بکردایە، دەبوایە سەرلەبەری کتێبەکە، بە شێوەیەکی دی دابڕێژینەوە، ئەوەش کاری کردنێ نەبوو.

م.زیاد لەم کتێبەدا، هەر بەیتێکی لە چەند بەیتێك ئامادە کردووە، بۆ نموونە (گەلۆ)ی لەسەر چەند (گەلۆ)یەك، داڕشتووەتەوە و گەلۆیەکی دیکە و جیاوازی لێ بەرهەم هێناوە، پێشی وابووە، بنەچەی بەیتەکان، لە بنەڕەتدا بەو شێوەیە بوون و دەنگخۆش و بەیتبێژەکان،

بە زەوق و ویستی خۆیان لێیان زیاد و کەم کردوون. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە کارانە تەنیا بە دوو شێوە دەکرێ:

یەکەم: هەندێ دەنگخۆش و بەیتبێژ، دوای ئەوەی فێری چڕینی بەیتەکە دەبن، گۆڕانکاری تێدا دەکەن و سیمای خۆیانی پێ دەبەخشن، سەلیقە و هەستی شاعیرانەی خۆشیانی تێدا تاقی دەکەنەوە. ڕستە، دەستەواژە و وێنەی شیعریی خۆیانی تێدا بەکار دەهێنن، هەر ئەوەشە جیاوازی لە نێوان هەندێ لایەن و وردەکاریی دەقە فۆلکلۆرییەکاندا پەیدا کردووە.

دووەم: بەراوردکردن، بنەمایەکی زانستیی دەقی فۆلکلۆرییە، بە هێنانەوە، یان نووسینەوەی چەند دەقی بەیتێك و بەراوردکردنیان، دەرخستنی خاڵی وێکچوو و جیاوازیان. دواتر ئامادەکاری تێکستەکان، ڕەنگە بکرێ و بگونجێت، دوای لێکۆڵینەوە، دەقێکی تەواویان لێ بەرهەم بهێنێت. لەم کتێبەدا، ئەرکی دووەم بێ ئەرکی یەکەم کراوە.

لەبەر هەموو ئەمانە، دەستکاریی زۆرمان نەکردووە، تەنها لە ڕووی خاڵبەندی، یەکخستنی بەکارهێنانی وشە، ڕێنووس و هەڵەبڕی، ڕوونکردنەوە و دانانی پەراوێزەوە، کارمان لەسەر کردووە. بەشی چاپ و لێکۆڵینەوەی ئنستیتیوتیش، هەندێ پەراوێزی بۆ داناون.

هیواداریین ئەم پێشبارە، وەك دوابار و نۆ کتێبەکانی دیکەی ماموستا زیاد، خانەیەکی دیاری کتێبخانەی کوردی بگرێ و جێی ڕەزامەندیی خوێنەران و لێکۆڵەرانیش بێت.

**بوار نوورەدین- ئارارات ئەحمەد**

# سەرەتا

ساڵانە، گەڕانەوە و هاتنەوێ تەیرێ گەرمێنێ، لە نێوانی زستان و بەهاراندا بۆ کوێستانان، مزدێنی هێنی کۆتاییە تەمەنی زۆرداریەتییە زستانێ و تێکشکانێ چەکە کوشندە و سەرما و سۆڵەکانییەتی.

بێگومان ئەم مزدێنییە و و مزدێنییەکانی، سەرەتای وەدەرکەوتن و دیاردەی وەرزی بەهارێ و، دەست بەخۆداهێنان و ئارایشتکردنێ سروشتی دەشت و کەژ و کێوی وڵاتی و، ڕازاوەییە زەوینێ بەزاوزێی بەرهەمەکانی، تێکڕای زیندەگی و قەشەنگییان، دیارە ئەگەر ئەوانە و زۆر دیاردەی جوانی دیکەش، هەر هەموویان دەبنە خڕۆکێکی نێو خوێنی دڵ و دەماری جەستە و هۆشی کوێستانیان و ئارەزوو بزوێنییە وەدەرکەوتنی، بۆ نێو چیا و چۆڵ و دۆڵ و لاپاڵ و دەشتان.

ئێستێ، سپێدەیە و تیشکی زەردی خۆرێ سەر لوتکە ئەنگێوە، ئاسمان سامالێکی سادەیە، کوڕەلاوێك لە لاپاڵێکی، لەسەر بەردێکی دانیشتووە، پشتی خۆی لە چیا و تیشکی خۆرێ کردووە، گۆچانە برادەرە هەمیشەییەکەی، لەسەر کۆشی خۆی داناوە، بەرەو دەشت و ڕووبار و جۆگە و جۆگەلە و مەڕەکانی دەڕوانێ و سەر هەڵدەبڕێ و ئارەزووی گۆرانییانی دەبزوێ و جەمەدانەکەی بە لاتی سەریەوە دەنێ و دەستێکی دە بناگوێی دەنێ و پڕ بەدڵ تێڕاهەڵدەکاتێ:

هاتنـەوە تـەیرێ گـەرمێنێ، ئێسـتا زسـتانی مـاوە
گەینەوە سـەر چۆمی کەڵوێ[1]، لـەوێ کردیـان بڵاوە
لەبەر ئەو چاوەت دەمرم، سوار و پیـادەی ڕۆ نـاوە[2]

هاتنـەوە تـەیرێ گـەرمێنی، بـە فڕینێـی خاسـەکەوە
بـاز و شـەهێن و شمقـار، تـەڕلانێکیان[3] پێشـڕەوە
ئەو ساڵ زستانی ساردە، وەرە جووت بین پێکـەوە

هاتنـەوە تـەیرێ گـەرمێنێ، بـەوان دەڵـێن مـراوی
سەربالێ خۆیان شۆڕ کرد، بۆ چۆم و نێو گۆلاوی
سـەر و مـاڵم مزدێنییـە، ئەگـەر هـەڵبێنێ چـاوی

دە بـا لێنـێن[4] پێشـباران، هـەواری کەنـد و لەنـدان[5]

---

١- کـەڵوێ: نـاوی زێـی بچـووك، کـە دەڕژێتـە سـنووری پشـدەر. ئـەو چـۆمە، لـە سـنووری شارسـتانیی سەردەشـت، لـە گونـدی (مـیراوێ) تـا تەنگـەی گونـدی (گرژاڵ)ی، پێی دەگوترێ چۆمی کەڵوێ. (ئنستیتیوت).
٢- ڕۆ ناوە (ڕۆنان): وشەیەکی ڕەسەنی پشدەر و موکریانە، واتا دایناوە، داینیشاندووە. ڕۆنیشە: دانیشە. لە شیعرەکەدا کینایەیە بەوەی کە جوانی چاوی کچەکە، هێندە جوانە، هەموو خەڵکی بە سوار و پیادەوە، لە شوێنی خۆی ڕەق ڕاگرتووە!
٣- تەڕلان: جۆرە بازێکی هەمیشە بە زەوق و نەشئەیە. (ئنستیتیوت)
٤- لێنێن: بارکەن، بارەکان بار بکەن.
٥- لەند: هێندێك جار بۆ هاوسەنگی لەگەڵ وشەی کەند بەکاردێت، وەك وشەکانی مـاڵ و حـاڵ، کـار و بـار، جـار و بـار و تـاد... هـەروەها کوێسـتانێکە دەکەوێتـە (شێخان) لە سنووری مەهاباد لە خۆرهەڵاتی کوردستان. (ئنستیتیوت)

خێڵی قادری سێمانی، هەڵیان دا لە سامڕەندان[1]
دە کچێ بێنە ماچت کەم، لە شایی و زەماوەندان

دە با لێنێن پێشباران، ماڵ ڕۆیین دەروو دەروو[2]
یار گەڕاوە دوای خێڵی، کەڵەگەتێ خاڵ لە ڕوو
لە نێو بۆڕ و بێژانێ[3]، تێر دانیشتین دوو بە دوو[4]

هەر ئەگەر[5] وەرزی زستانێ تەمەنی هەڵکشا و گەیشتە نزیکی مردنی، مەڕدار بۆ وەدەستهێنانێ ئامرازی پێویستی دەشت و دەران، دەکەونە کەرەستە پەیداکردنێ و خۆسازدانێ، بۆ وەردەرکەوتنێ لە

---

١- سامڕەند: کوێستانێکە لە کوێستانەکانی دەڤەری شنۆ لە خۆرهەڵاتی کوردستان. (ئنستیتیوت)

٢- دەروو: گەروو، تەنگەبەرایی، دەربەندی چکۆلە، ڕێبازی ئەمدیوە و دیوی کەلێنی چیایان.

٣- بۆڕ و بێژان: دوو گیای کوێستانین، چڕ و پڕ و شێوە دەوەنین. (ئنستیتیوت)

٤- سەرچاوە: پێشبار، گۆرانییەکی کۆنی فۆلکلۆری کوردییە، ساڵانی ١٩٧٠ لە حاجی شێخەی خەڵکی گوندی (سوڵتانەدێی نوێ)ی قەڵادزێ- م بیستووە. ناوبراو کەوتبووە تەمەنەوە، بەڵام هێندێك جاران یادگاریم وەبیر دەهێنانەوە و دەمبزاوت! ئەویش بە گۆرانییەکی خۆش، یادی سەردەمی گەنجێتییە خۆی، خەمی نێو دڵەکەی دەتاراندن. هەر چەندە ئەو دەمە، ڕۆژگارەکان زۆر ناخۆش بوون، بەڵام ئەو گۆرانییەم نووسییەوە و لە (کەشکۆڵی پێشبار)دا تۆمارم کرد، کە لە نێوان ساڵانی ١٩٨٣ تا ١٩٨٥ نووسراونەتەوە و ئێستاش جار جارە بابەتانی لێ هەڵدێنجم.

٥- ئەگەر: لە بابەتی ڕێزمان و زمانەوانیدا، (ئامرازی مەرجی)یە، بەڵام زۆر جاران وەك (کە)ی (ئامرازی پەیوەندی) دەردەکەوێت. ئەم حاڵەتە لە ئاخاوتنی پشدەر و موکوریاندا زۆر زۆرە و مامۆستا زیادیش لەم کتێبەیدا و لێرە تا کۆتایی کتێبەکە، زۆری بەو شێوەیە بەکار بردووە. (ئنستیتیوت)

نێو گوند و ماڵان. ئەگەر ڕۆژی بەهاریش گەیشتە مانگی بانەمەڕێ، سووکەڵە بارگێکی[1] بار دەکەن و کوڕەلاو بەرەو کۆنەهەوارێ وەسەر دەکەون، لەوێش کەڵەکە ڕوخاوی دیواری پار، لە نوێ دادەمەزرێننەوە، جێی کار و کردە و ماڵ و میوانان، ڕێك و تەخت دەکەن، جۆگە و جۆگەلە و کانی و کانیلەی پڕ بووەوە، بە قوڕ و لیتە و چقڵ و دڕك و گەڵا وەریوێ پاییز و زستانێ پار، خاوێن دەکەنەوە. جێی گۆڕاییە شاییە ڕەشبەڵەکێ، شەوێ بەر شۆقی مانگەشەوان لە خواروو هۆبەی[2]، تەخت و بەردبژێر دەکەنەوە.

لە دوای ماوەی چەند ڕۆژێکانیش، مەڕ و ماڵات و شوان، بە قۆناغ هەڵدەکشێن، پوور شەمام و مام هۆمەر، بە سوارییە وڵاخان و گێڕانەوێ یادگاران، هێمنانە بەرەو هەوار دەبنەوە، پیرۆز و خاتوون و سوارە و لاسیش، گەنجانە و بە دەم جەفەنگانەوە، ڕێی دوور و هەوراز، لەبەرخۆیان تەخت و نزیك دەکەنەوە و خۆیان بە هەواری شاد دەکەنەوە.

تاوڵ و سابات و کەپر، لە نوێ دەبنەوە خاڵی ڕەشی سەر گۆنەی مێرگ و مێرگۆلان. ماڵات و زیندەوەر، زیندەگییە وەبەر دەشت و گرد و لاپاڵان دەنێنەوە. کیژ بە باڵۆران و، کەو بە قاسپەی، بەسەرهاتان بۆ یەکدی دەگێڕنەوە. کوڕ، بەستان[3] و، بولبول چەهچەهان بەسەر یەکدیدا هەڵدەڵێن و گوێ بۆ یەکدی ڕادەدێرن.

---

١- سووکەڵە بارگێك: بارگەیەکی سووك، بارێکی چکۆلە، سووکەبار.

٢- هۆبە: کۆمەڵێك ڕەشماڵ پێکەوە، کە هەموو تێکڕا خزم و کەس و نزیکی یەکترین. (ئنستیتیوت)

٣- بەستان: کۆی بەستە، گۆرانی کورت کە هەر دوو نیوە دێڕ تا شەش و هەشت نیوە دێڕیشی هەیە کە یەك سەروایان هەیە. (ئنستیتیوت)

گەلی برادەران!

ئـــەمن لێـــرە و لـــەو گردوکۆیـــە و ڕێکخســـتنەوە و وەســـەر یەکدینانەوەیـدا، کـە دەربـارەی بابەتـەکانی نێـو ئـەم دوو بەرگـەی کردوومـە، تـەنێ مەبەسـتم ئەوەیـە، وەکـو کۆنەهـەوار نوێکردنـەوێ، ڕزگارکردنـێ ئـەم سامانە بـە نرخانـەی بـاب و باپیرانمـان، لـە پـەرت و بڵاوی و نەمانێ و، خستنە پێشت چاوان.

هیوادارم، ئەگەر کەسانی ڕۆشنبیر و زانای بە توانا، ئەکادیمیانـە و و زانستانە، لەم بەرهەمە بە نرخانە بکۆڵنەوە و هەڵیانبسەنگێنن، ئەو جار بە پوختەیی و بە درەوشاوەیی لەسەر شانۆیانیان نومایش بکەن و بینەرانیش پڕ بە چاوان بیاننۆڕنێ، سەری ڕەزامەندییان بۆ ڕابـژێنن و چـاوی تێبینییـان پێـدا بگێـڕن و لەبەرخۆیانـەوە بیانڵێنـەوە و ئـەم شیعرە نازدارەی (ئەسیری)ی شاعیریان بەرابەر بڵێن کە کوتویە:

بێـرە کوردسـتان عـەزیزم، گـەر تـۆ سـەیرانت دەوێ
بتبەمـە قەنـدیل، ئەگـەر گـوڵزاری کوێسـتانت دەوێ
سـەیری ئـەو خێڵانـە کـە، نیشـتوونە داوێنـی چـیا
با بچین بـۆ ماڵی کـوردێ، گـەر تـۆ خوێشـانت دەوێ

## گوتنێکی پێویست

بێگومـان وشـه و ئـاوازی ڕەسـەنی کـوردیش، هـەر وەکـو هـەبوونێ تێکـڕای ئـەم جـۆرە هونـەرەی گـەلانی دیکـەی سـەر ڕووی زەمینـێ، بەرهـەمی لەمێـژەوەهاتووی کـارای پێویسـتی، هونـەری نەتـەوەیی کوردانـە و بـە هـۆی پێویسـتی پێبوونـێ، بـە بەردەوامییـە کاتـانیش، هەمیشـە پـەرەیان پـێ دراوە و هـەتا ئێسـتێش هـەر ماونەتـەوە. ئاشکراشە، ئەگەر هەر بە هۆی وشەشەوە تێکڕا لە کۆنەوە کەسەکان لـە یەکـدی تێگەیشـتوون و کـارە کۆمەڵایەتییـەکانی ویسـتراوی نێـو خۆیانیـان، پـێ ئەنجامـداون و هەسـت و مەبەستەکانیشیان بە ئـاوازی گونجاو، لەگەڵ سروشتی کورد و کوردستان و باری کۆمەڵایەتییە ئەو سەردەمەی، پێ دەربڕیون و گەشەیان پێکردوون.

وشـە و ئـاوازی هـەر نەتـەوێکی، تایبەتمەندییـە گونجـاو و شـیاوی خۆی هەیە، کە لەگەڵ وشە و ئاوازی هـەر نەتـەوێکی دیکـەدا جودایـە، هەر لەبەر ئەو لێك جوادییەشە، کە لـەم ڕووەوە تـاکی هـەر نەتـەوێکی، هۆگری بەرهـەمی نەتەوەکـەی خـۆی بـووە. بـەڵام هـەر وەکـو پێشـینان گوتویانە: چەم بێ چەقەڵ نابێ! یان هـەر وەکو شێخ ڕەزای تاڵـەبانی، دەربارەی چاکییە باب و باپیرانی و خەراپییە خۆی، گوتویەتی:

ڕەزاش هەر لەو نەسلەیە، بیبەخشە خودا، کە قەت نابێ
گوڵی بێ خار و، بەحری بێ بوخار و، ئاگری بێ دوود[1]

---

١- سەرچاوە: دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، ١٩٩٩، چ(سەرکەوتن)، سلێمانی، ل٧٧.

بێگومان و ئاشکرایە، هەر لە کۆنەوە لە نێو کورداندا کەسانێك هەبوون، کە خۆ سووك و بێگانەپەرست بوون، بەرهەمی هونەریی خەراپی گەلانی دیکەیان، زۆر پێ لە بەرهەمی چاکی کەسانی هونەرمەندی خۆیان چاکتر بووە. دیارە ئەم کارەش ڕەوشێکی گەلێك ناپەسەند و ناڕەوا و خۆنەویستانەیە، لە دەستدانی هەستی پیرۆزی نەتەوایەتی و مرۆڤایەتییە.

بۆ بەڵگە، وەکو ئێستێم وەبیر دێ، کە شەست حەفتا ساڵێك لەمەوبەر، کورد گەلێك گۆرانی و ئاواز و وشەی ڕەسەنی هەبوون، ئەم گۆرانییانەش بە دەنگی گۆرانیبێژە کوردەکان، لە ئێستگەی ڕادیۆی بەغدایەوە پەخش دەکران و گوێشیان لێ ڕادەگیران، لە لایەکی دیکەشەوە گۆرانییە جۆراوجۆرە عەرەبییەکان، تا ڕادێکی زۆر لە باشووری کوردستانێدا، پەرەیان ئەستاندبوو، ئەو کارەش نەکو هەر لە شارەکاندا، بەڵکو گەیشتبووە نێو لادێ دوورە شارەکان و بە نێو زۆر دۆڵ و لاپاڵی بنارانیشدا بڵاو بووبوونەوە، تەنانەت زۆر لەو کەسانەی ئەو گۆرانییە بیانییانەیان دەگوتنەوە، تەنیا لە وشێکی گۆرانییەکەش تێ نەدەگەیشتن.

ڕۆژیش لە دوای ڕۆژان ئەو گۆرانییە عەرەبییانە هەر پەرەیان دەستاند و گەشەیان دەکرد، بە پێچەوانەشەوە، گۆرانییە کوردییەکان، بەرەو پووکانەوە و بێ برەوییە دەچوون، تا کار گەیشتبووە سەر لێواری مەترسییەکی خەراپ، بەڵام ئەو بەرهەڵستەی لەو کاتەدا چاوەڕوان نەدەکرا و لە نەکاو ڕووی دا، ئەوە بوو کە لە ئێستگەی کوردیی ڕادیۆی بەغدایەوە، بێ پێشینە و زانین و ئاگادارییەتی، دەنگی خۆش و ئاوازی ڕەسەنی کوردیی گونجاو

لەگـەڵ سروشـتی کوردسـتانێدا، لـە گـەرووی هونەرمەنـدی بۆکـانی (حەسەن زیرەك)یەوە، هەموو کوردستانی ئاوەدان کردەوە.

بێگومان، هەر بە زوویش گەنجانی دەنگخۆش، گۆرانییەکانی: قاسپە قاسپی کەو دێ، هـەی ئێران خۆشـە گـەرمێن، ئایشیلێ ناسکە جوانـێ، ئـەی شـۆڕێ مـاڵم شـۆڕێ و...هتـد، حەسـەنانە و زیرەکانـە بـە هـەوا و هەوەسەوە دەگوتنەوە، گوێگرانیش بە خۆشییەوە گوێیان بۆ ڕادەداشتن و چێژیان لێ وەردەگرتن و سەری فەرامۆشییان بۆ ڕادەژاندن و لـە دۆڵ و دەشـت و چیا و کارکردناندا دەیانگوتنـەوە. لـە لایـەکی دیکەشـەوە، ئـەم گۆرانییانـە بوونـە هـۆی گەشـبوونەوە و هەسـتانەوێ گۆرانییـە کوردییـە پشـتگوێ خراوەکـانی پێشـووتر، دیـارە بـەم ئـاوێزان و یەکدی گرتنـەش، گۆرانییـە داگیرکـەرە بیانییـەکان، برەویـان کـەم بوونـەوە و بـەرەو خـوار کرانەوە، بۆ ئەو شوێنەی کە لێوەی هاتبوون.

ئـەمجار، پـاش تێپـەڕبوونێ چـەند سـاڵێکی دیکـە، هێرشـەکەیان هێنایـەوە، بـەڵام دیسـان هـەر وەکو جارێ پێشوو، ئەوەندەی پـێ نەچوو تووشـی بەرەنگاربوونـەوێکی بـەهێز و سـەختی هونـەری ڕەسـەنی هونەرمەندی گەورەی گۆرانیبێژی سابڵاخی (محەممەدی ماملێ) بوونـەوە و بـە چـەکی وشـەی ڕەسـەن و ئـاوازی خـۆیی، سـەنگەری مەردانـەی لـێ گرتن و بە ڕەوە و کۆمەڵ، بە هەڵدێری لێژییەدا خواریان کردنەوە.

هەمدیسان داگیرکارانە و بێ ئابڕوانە و بـێ لەبیرچوونەوێ بەزینەکانی ڕابوردوویـان، هـەر وەکـو نـەریتێکی خـوو پێـوە گرتـوو، لـە دواتـردا پەلامارەکـەیان، بـەبێ ئـەوەی گـوێ بدەنـە بەربەسـت و بەرەنگاربوونـەوێ، هێنایـەوە، بـەڵام هـەر وەکـو جـارانی پێشـووتر، ئـەمجارەش کۆمـەڵێك

هونەرمەندی بە توانا و دەنگخۆشی سەردەمی نوێ، لێیان ڕاپەڕین و لە نێو شار و لادێیەکان، لە کوردستانێیان وە دوور خستنەوە.

جا، لە کۆتایی ئەم ئەنجامەیدا، ئەمن لێرەدا دەڵێم: ئەوەی پێداویستییە کار بۆ کردنێیە ئەوەیە، کە نەوەی نوێ لە ئاستی هەموو داگیرکارانیدا، نە خۆیان و نە هونەری نەتەوەکەی خۆیان، بە کەم نەزانن، بەڵکو پێویستە هونەرە ڕەسەنەکەی پێشینانمان، کە لە مێژەوە لە چوار لاوە پەلامار دراوە و دزراوە و بزر کراوە و شێوێندراوە، لە نوێ بدرێتەوە و پاك و پوختە و ڕێك بخرێتەوە و برازێنرێتەوە، ئەمجا لە جامخانەی پێشانگایان و لە نومایشکردنێ هەر جۆرە جوانییەکی قەشەنگی بێ پەڵەدا بەدیتریێ، کە چۆن بەرهەمی نمایشکراوی دەبنە پووگەی سەرنجدانێ جوانویستان و دروستکۆیان، جا ئەو دەمەی دەبیستریێ و دەبیندریێ، کە چۆن جوانپەرستان دەستە بە دەستە بەرابەریان ڕادەوەستن و و بە سەرسووڕمانەوە چاویان لێدەکەن و دەستی ڕەوا لە ئەستۆی خۆیان دەدەن و ئەم تاکە شیعرەی (مستەفا بەگی کوردی)یان بە ڕوودا دەڵێن:

دووڕ و یاقووت دەبارێ، لەم کەلامە شیرینەی کوردی
خودا سا کوا؟ لە دنیادا قەدرزانێ، خریدارێ![1]

پێشینانیش گوتویانە:

هەر کەسێك بکا بێگانەپەرستی
لە دوایەدا هەر دەهێنێ نوشوستی[1]

---

١- دیوانی کوردی، چاپی چوارەم، چ(کوردستان)، هەولێر، ١٩٧٢.

# گۆرانی

لــە نێــو ئــاپۆرای تێرامــان و وردبوونــەوە و هەڵســەنگاندندا، وا دەردەکــەوێ کــە وشــەی گــۆرانی، لــە بنەچــەوە وەکــو خاوەنــداریتی، سەرچاوەکەی لە هونەریەتییە هۆزی (گۆران)ی کوردەوە هاتبێ، یان لە خودی وشەی (گۆتن)ـەوە بە گۆڕان بەسەرداهاتنندا، بڵاو بووبێتەوە. جا ئەگەر لە بنەچەدا لە هەر چییەکی دیکەوە هاتبێ، هەر وەکو دیارە ئەوە وشەکە (گۆرانی)یەو هەیە و سەلمێندراوە و لە نێو کۆمەڵەی وشەگەلی کوردیدا، جێی ڕاست و دروست و شیاوی خۆی گرتووە و پێناسەی پراوپڕی باڵای بڵندی دەدرەوشێتەوە. وەکو هەگبەی ئاوازانیش، گەلێك بابەتی نایابی ئاواز لە یەکدی جودای کوردانی کەڵکبەخشی ویستراوی بۆ مەبەستە جۆراوجۆرە پێویستییەکان، لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە و بەم کارەش بووەتە کۆگای خۆراکە گرنگەکان بۆ فەرامۆشییە بەخشینێ گوزەراندنێ هەموو جۆرە ژیانە کۆمەڵایەتییەکانی کوردان.

ئەم هەگبە پڕ لە گۆرانییە، گەلێك بابەتی جۆراوجۆری لە نێو هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە، ئەوانەش، وەکو بابەتەکانی: حەیران، لاوك، مەقام، هۆرە و سیاچەمانە، کە هەر یەکێکیش لەم بابەتانە، کەم یان زۆر، کۆمەڵێك ئاوازی جودا جودایان وەخۆ گرتوون، کە لە چڕینیاندا بۆ مەبەستە ویستراوەکانی وەکو: سەر ڕاژاندنێ، هەڵپەڕینێ، خەم خواردن و گریان و چەند بابەتی دیکە، کەڵکیان لێ وەردەگیرێ و خەڵکی کوردیش بە گوێرەی وشە و ئاوازان، دەچنە نێو

---

١- فۆلکلۆر.

مەزرای ئەندێشە باڵەفڕە پێکردن و خۆ لە بیرچوونەوێ و ڕۆچوونە نێو جیهانێکی دیکەوە، بە هێندێك ئاوازانیش دەکەونە چاو پێلوو پێکەوە ئاوێزانکردن و جودابوونەوێ و لە یەکدی کردنەوێ و گەیشتنە نێو گوڵزاری خۆشی و خامۆشی و فەرامۆشییانەوە.

هەر وەکو گوتمان، تێکڕای گۆرانییەکانیش بۆ گوێدێران ئارامبەخش و فەرامۆشهێنن، جا هەر ئاوازێك بە جۆرێك، تەنانەت کە هێندێك وشە و ئاواز، بە گریان و فرمێسك هەڵوەرێنن و زار و زمانانیش دەخەنە کڕووزانەوە و نووزە نووزان. بێگومان ئەو خەم و فرمێسك هەڵوەراندنانەش، تا ڕادەیەکی زۆر ئارامبەخشی جەستە و گیان و ژیانێن و هێوربوونەوێ کەف و کوڵێ ژوارە بە سوێیەکانن و هیوابەخشی ڕزگاربوونێن لە تەنگانان، گەیشتنە نێو مەزرای زەنوێری خۆشییان، هەر وەکو نالی گۆتیتی:

تا نەگریا ئاسمان و تەم ولاتی دانەگرت
گوڵچەمەن ئارا نەبوو، هەم لێوی غونچە وا نەبوو[1]

لێرەوە، لەم بەیتە شیعرە نایابەدا دەردەکەوێ، کە هەوری ڕەشی گەدەگەورەی ورگشۆڕی نەوی بە زەمینێ، ئاوس بە ئاوی ژینێ، ڕووی جوان و پاکی ئاسمانێیان داپۆشیوە و بوونە هۆی بزرکردنێ جوانییەتییە خۆری ڕۆژان و مانگ و ئەستێرەی نێرگزجاڕی شەوان و داهێنانی خەمخواردن و گریاندنێ ئاسمانێ، فرمێسك هەڵڕشتن و ژانگرتن و بەرفڕێدانێ[2]، کە ئەو

---

١- دیوانی نالی، ئینتیشاراتی سەلاحەدینی ئەییوبی، ورمێ، سپهر- تاران، ل٣٧١.

٢- بەرفڕێدان: بەرهاویشتن، لەبارچوونی بەچکەی ئاژەڵ، هاتنە دەرەوەی بەچکەی ئاژەڵ لە زگی دایکیدا بە مردوویی. (ئنستیتیوت)

بەرفرێدان و تەقوتۆق و گرمەگرمەش، لە دواتردا دیارە دەبێتە هۆی ئەوەی، ئەگەر ڕووی جوانی ئاسمانێ وەدەردەکەوێتەوە و زەمینێ ولآتیش، بە ئاوی ژینێ بە گوڵزاران برازێنێتەوە و بە بەرهەمانیش، ئاوەدانیان بکاتەوە، ئاوێ پەرەپێدانێ ژیانێش، بە جۆگە و چۆم و ڕووباراندا، لاشەی بە دوای سەریدا ڕاکێش بکات و بڕوا و بگەڕێ بە دوای زەمینە نەزۆك و ڕووتەنە بێ بەرهەم و بێروون و تینواندا، بە زمانێ خۆی، بە سەرجەمی بوونەوەر و زیندوان بڵێ: تا ئەمن بمێنم، ئێوە لە ژیانێ خۆتان بێ هیوا مەبن، دیارە ئەگەر ئەمنیش هەمیشەییم و ئەگەر تەنگانەش هاتن، ئەوە دڵنیابن، کە پێشینان ڕاستیان گوتووە: تەنگانان بەریان کورتە. خۆڕاگرتنیش، هەر چەندە تاڵ بێ، بێگومان بەرهەمەکەی شیرینە.

بێگومان ئەو شیعرە پتر لەوە هەڵدەگرێ ئەگەر لێی بدوێین، چونکە لەسەر ڕۆیشتن پتر لە باسەکەی خۆمان وەدوور دەخاتەوە، جا لەبەر ئەوەی وا باشە بێینەوە سەر (گۆرانی)یەکەی خۆمان و بڵێین: لەبەرئەوەی کە گۆرانیی فۆلکلۆری کوردی، سەرهەڵدە و دەرکەوتە و گەشەکردە و پێگەیشتەی نێو هەناوی سروشتی هەمەڕەنگ و زۆر جۆرەکانی ناخی خاك و مرۆڤی کوردە، لە دەروونی ئەشقی دروستەوە سەری وەدەرناوە، هەر لەبەر ئەوەشە هەمیشە و لە هەموو کوردستانێدا، ویستراوی ئارامی و خۆشییە گیانێ و پێویستی گرنگە ژیانێیە، ڕەسەنایەتییەکەشی بووەتە هۆی مانەوێ خۆی لە نێو سەرجەم کۆمەڵانی خەڵکی کوردستانێدا، پێویستی پێبوونێ هەموو دەمانیشی، هەر بەو ڕەسەنایەتییەشەوە ویستبەندە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە، لە هەموو گەشت و گوزار و سەیران و جۆرە جودایە دانیشتنەکاندا، ئەگەر گۆرانی گوتن بێنە کایەوە، بێگومان گۆرانییەکانی حەسەن زیرەك، محەممەدی ماملێ،

عەلی مەردان، تایەر تۆفیق، ڕەسووڵ گەردی و...هتد، دەگوترێنەوە، کە ئەوانیش هەر لە هونەرمەندی پێشووتری خۆیانەوە وەریانگرتوون و گوێگرانی کوردیش پێیان هەڵپەڕیون و سەری پڕ ئەندێشەیان بۆ لەقاندوون و پێیان هەڵپەڕیوون.

دیارە ئەم چێژ وەرگرتنەش لە چێژی گۆرانییە نوێیە ئاوازهێندراوە دەرەکییەکاندا وەرناگیرێ، هەر لەبەر ئەو هۆیەشە کە گوتنی گۆرانیی ئاوازبیانی، ویستراویەتی و کردەکاریان لە نێو تاکی خەڵکی کورد، زۆر کەمە، یان هەر نییانە، چونکە دیارە هەر نەتەوەیەك بە هونەری هەڵقوڵاوی ڕەسەنی نێو هەستی خودی خۆی، فرچك دراوە و گوێدێر کراوە و لە هەر هونەرێکی دیکەشی لێ جوانتر و لێوەشاوەترە، وەکو: لایلایە، ڕۆڵە لایلایە، جوانی گوتوە شاعیری بەرزی بیرتیژی (حەمدی) کە فەرموویەتی:

گوڵ لە بەرگی سەوزی خۆیدا نازك و شیرینترە
بۆیە فکری نازکی حەمدی هەر بە کوردی بێژرا[1]

---

١- دیوانی حەمدی، چاپی دووەم، چ(سەرکەوتن)، سلێمانی، ١٩٨٤، ل٢٠٤.
دیارە لە دیوانی ناوبراودا شیعرەکە بەو شێوەیەیە کە لەسەرەوە هێنراوەتەوە، بەڵام ئەوەی ئەمن لە پەنجاکانی سەدەی بیستدا لە سلێمانی و بە قوتابییەتی بیستوومە و لەبەرم کردووە و لەبەر خۆشەویستیانیشی لە بیرم نەچۆتەوە، بەم جۆرەیە:

گوڵ لە بەرگی سەوزی خۆیدا نازك و شیرینترە
بۆیە بیری تیژی حەمدی هەر بە کوردی بێژرا

لێرەدا ئەمن پێم وایە ئەوەی ئەگەر ئەمن لەبەرم کردووە، زۆر چاك و لووس و ڕێك و ڕەوان و لەبار و ڕاست و دروست و حەمدییانەترە لەوی دیکە. وشەی "نازك"یش، لە یەك بەیتە شیعردا دووبارە نەبۆتەوە.

بەکارهێنانی وشەی گۆرانی، کە ئێستێ لە نێو کوردەواریدا وشێکی گشتگیر و بەربڵاوە، لە زووتردا بێجگە لە نێو شاری سلێمانی و دەوروبەری نێزیکی، ئەم وشە بەکار نەهاتووە، بەڵام وشەکەش وەکو گۆرانی هەر لەم شار و دەڤەرەوە پەرەی ئەستاندووە و بڵاو بۆتەوە. لە زووتردا، لە سەرجەم دەڤەرەکانی وشەی ڕەسەن، لە مەرگە و پشدەر و بیتوێنێدا، کە ئەم دەڤەرانە لە ڕووی زمانەوە بەشێکی زاراوە زمانی موکریانین، لەبریی وشەی گۆرانیبێژ، هەر وشەی دەنگخۆش بەکار هێنراوە و لەباتیی وشەی گۆرانیش، هەر بەتەنێ تاکە پێکهاتەکانی گوتراوە، وەکو: حەیران، لاوك، قام، مەقام، بەستە و...هتد، هەر وەکو ئەگەر بە گۆرانیبێژێکی بگوترابایە: ئەرێ برادەری خۆم، گۆرانییەکیمان بۆ بڵێ، پێی دەگوترا: کاکی خۆم حەیرانێك، لاوکێك، قامێك، یان بەستەیەکیمان بۆ بڵێ، نەکو پێی گۆترابایە گۆرانییەکیمان بۆ بڵی! یان ئەگەر گۆرانیبێژەکە لە گوتناندا سەرپشك کرابایە، ئەوە پێیاندەگوت: هەر چی دەڵێی هەر باشە.

دیارە هەر وەکو وشەی گۆرانی، لە دەڤەری سۆرانێدا وشێکی گشتییە، هەروەها وشەی (ستران)یش لە دەڤەری بادینانددا، وشێکی گشتگیری ئەم بابەتە ئاوازە دەنگییانەیە.

ئەمن لەم کارەمدا، ئەوەندەی پێم کراوە ئەم بابەتە هونەرییە دەنگییە وشەییانەم نووسیونەتەوە، کە لە هەر گۆرانیبێژێك، پارچێك یان دوو پارچەی لە هەر بابەتێکیدا چڕیوە، وەکو دەبیندرێ لە هەوڵەکەشمدا ئەم پارچە پارچە پەرت و بڵاوانەم بە گوێرەی گونجانێیان، ڕستەکانم بردوونەوە جێی دروستی خۆیان و پاش و

پێشی کۆپلەکانیشم وەکو سەرەتا و نێوەرۆك و کۆتایی، چارەسەر کردوون و لە پچڕپچڕییەوە، کۆمکردوونەوە.

بێگومان، شارەزایەتییەکەشم لەم بوارەیدا، یاریدەی کردووم، وشە شێوێندراوەکان و تەم و تۆز لەسەرەکانیشم، وەدەرخستوونەوە و ڕوونم کردوونەوە و بە ڕەونەقەوە هێناومنە پێش دیتەی سەرنجداتان و بینەران.

هیوادار و دڵخۆش دەبم، ئەگەر هێندەی توانای خۆم، کەمێکیشم لە زۆران و زۆرتران بەدەستهێنابێ، خزمەتێکم بە هونەری وێژەی ڕەسەنی فۆلکلۆری کوردی کردبێ، خوداش فەرموویەتی: کار بە گوێرەی توانایە. دیاری شوانانیش بۆ خۆشەویستان هەر بەرهەمی کەژ و کێوانە.

## گەلۆ، وەکو دەق (تێکست)

**ئەهای گەلۆۆۆ، هاوارە لە من گەلۆۆۆ**
**ئەوە گەلی دۆستان و گەلی برادەران و گەلی ماجەرایێ،**
**ئەورۆ خەمێ لە دڵی من پەراگەندە[1] بوون و کەوتوونەوە ڕا و بێڕایە[2]**
**ئـەمن زەینـی خـۆم دەدایـەوە تیلـەی[3] کوێسـتانێ، ئەوبەرەوبـەری کاولەسۆمایێ[4]**
**سەریان دێنایەوە دەرێ: بنجی سوێسنێ، هەڵاڵی، شلێرێ، شەشـپەڕێ، بـەیبوونێ، گیابەنـد و خـاوێ، لەگـەڵ قۆپـەنی[5] شەنگەبیزایێ!**

***

**ئەورۆ ناخۆشییەك پەیدا بووە**
**لە نێوانێ گوڵی بەهارێ، لەگەڵ خەت و خاڵی شیرین لەیلایێ[6]**
**شلێرێ دەیگوت بە شەشپەڕێ، شەشپەڕ دەیگوت بە هەڵاڵێ**

---

١- خەمی لە دڵم پەراگەندە بوون: لە بەشەکانی دواتری ئەم کتێبە، بە درێژی لەسەری نووسراوە.

٢- (ڕا) و بێڕایە: دوودڵی، بڕیاردان و پەژیوانبوونەوە.

٣- تیلە: سیلە، گۆشە، سووچ، کەنار، لاپەڕ.

٤- سۆما: گوندێکە لە گوندەکانی دەڤەری شکاکایەتی لە خۆراوای شاری ورمێ، لە دەڤەری برادۆست و زێدی سمایلاغای شکاك و باب و باپیرانی بووە.

٥- قۆپەن: بنکە ڕووەك، یان گژ و گیای بە تۆپەڵ. (ئنستیتیوت)

٦- شیرین لەیلا: لە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا بە درێژی لەسەری نووسراوە.

هەڵاڵێ دەیگوت بە سوێسنی، سوێسنێ دەیگوت بە گیابەند و خاوێ و...

تێکڕا دەکەوتنەوە هەرا هەرایێ

هەموو دەستەجەم دەبوون و دەچوونەوە خزمەتی شەنگەبیزایێ

هەتا پێکەوە بکەنەوە تەگبیرێ لەگەڵ ڕایێ

دەیانگوت: بیزا، ئەتۆ زێدە لە هەموانمان، ساڵێ دوو جاران

دەدرێیەوە لە قونێ ئەوێ کاولەدنیایێ[1]

هەستە وەرە لەگەڵمان، با بچینەوە خزمەتی مەلای،

هەتا شەرعێمان بکا و بزانین داخۆ کێهەمان جوانترین

لە مە[2] و لە خەت و خاڵی شیرن لەیلایێ!

هەموان دەستەجەم دەبوون و دەچوونەوە کن مەلای و

دەیانگوت مامۆستا هاتووین ئەگەر شەرعێمان بکەی،

هەتا بزانین کێهەمان جوانترین، لە مە و لە خەت و خاڵی شیرن لەیلایێ!

بەڵام ئەگەر شەرعێمان بگۆڕی، بە پرد و پێناومان بی[3]،

ڕۆژبازاڕی قیامەتێ،

ئەگەر تەرازوو دادەندرێ و خێر و شەڕ بەش دەکرێن

لەسەر بەردەکەی سەخرەتوڵلایی[1]

---

١- ساڵێ دوو جاران دەدرێیەوە لە قونێ...: لە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا بە تایبەت لەسەری نووسراوە.

٢- لە مە: لە ئێمە.

٣- واتا لە ڕۆژی قیامەتدا لە پێناو ئێمەدا ببیت بە پرد و بەسەرتدا بپەڕینەوە. (ئنستیتیوت)

دەستەونەزەر ڕادەوەستان بۆ فتوا و شەرعی مەلایێ
مەلا دەیگوت گوڵینە: ئەوە[2] هەمووتان جوانن،
شلکن، شیرنن، بەڵام شەرعی ئەنگۆ[3] بە من ناکرێ،
ئەوە هەڕوونەوە خزمەتی بایەکەی شەماڵی،
ئەو گەلێك دەگەڕێ لە کوێستانی گەورە و گران و
لە هەموو دەرکان، لە هەموو ماڵان، سەر وەژووری دەنێ و
لە زۆر دەرکی گەورەماڵ و میرەماڵ و مەزنەماڵان و خێرخوازان
وەردەگرێتەوە مالوڵڵایێ[4].

***

دەستەی گوڵان دەچوونەوە کن بایەکەی شەماڵی و دەیانگوت شەماڵ،
ئەمە هاتووین بۆ کن تۆ، ئەگەر شەرعێمان بکەی
هەتا لە خۆمان بگەین و بزانین
کێهەمان جوانترین، لە مە و لە خەت و خاڵی شیرن لەیلایێ!
بەڵام ئەگەر شەرعێمان بگۆڕی، بە پرد و پێناومان بی
ڕۆژبازاڕی قیامەتێ، ئەگەر خودا دەکا دیوانێ و
تەرازوو دادەندرێ و خێر و شەڕ بەش دەکرێن
لەسەر بەردەکەی سەخرەتوڵڵایێ.

---

١- بەردی سەخرەتوڵڵایێ: لە بە شێکی دیکەی ئەم کتێبەدا بە تایبەت لەسەری نووسراوە و قسەی لەبارەوە کراوە.

٢- ئەوە: ئێوە، ئەنگۆ.

٣- ئەنگۆ: ئەوە، ئێوە.

٤- مالوڵڵا: مالەڵڵا (مال الله): مالی خوا، ڕزقی خوا، زەکات یا خێر و سەدەقە. (ئنستیتیوت)

شەماڵ دەیگوت گوڵینە: شەرعێ ئەنگۆ بە من ناکرێ،
دەترسێم تەرازوێ مەزەندانم ڕاست دەرنەچێ و،
خوداگیر ببم و ڕۆژێ بەشکردنێ خێر و شەڕان
ڕووزەرد، بێمە دەرێ لەبەر لیقایێ[1]!
گوڵینە ئەوە هەڕوونەوە خزمەتێ پشووی بایەکەی نەرمی شیبایێ
ئەو گەلێك گەڕیدەترە لە من و زۆر وردە و قاسیدی خودای مەزنە
بە شەو دەگەڕێ لە نەویان، بە ڕۆژ لە بڵندان و
تازە هاتۆتەوە لە کوێستانە گەورەکەی با سەفایێ
ئەو گەلێك جواندیتەیە وساڵی بەری دوازدەی مانگێ،
هەر لەگەڵ گوڵان دەکاتەوە ساز و سەودایێ!

***

سەرپاکی ئەوان گوڵان وەکۆ دەبوون و
دەچوونەوە خزمەتێ بایەکەی شیبایێ
دەیانگوت: شیبا هاتوین ئەگەر شەرعێمان بکەی،
هەتا بزانین کێهەمان جوانترین لە مە و لە خاڵی سەر ڕوومەتی لەیلایێ!
بەڵام ئەگەر شەرعێمان بگۆڕی، بە پرد و پێناومان بی،
ڕۆژبازاڕی قیامەتێ ئەگەر خودا دەکا دیوانێ و، تەرازوو دادەندرێ
وخێر و شەڕ بەش دەکرێن، لەسەر بەردی سەخرەوتوڵلایێ.

---

١- ڕوو زەرد لەبەر لیقایێ: شەرمەزاری بەرانبەر بە خودای مەزن لە ڕۆژی قیامەتدا، کە ڕۆژی ڕووبەڕووبوونەوەیە، هەر وەکو مەحوی دەفەرموێ:
لە ڕووسووری عیبادەت لام و ڕوو زەردی خەجاڵەت مام
بە ناوی سێوی ناوم باغەوان و من بەهێ دەگرم

شیبا دەیگوت: گوڵینە ئەوە هەمووتان جوانن، ناسك، شلكن، لەبەر دڵانن،

بەڵام حەیفێکو هەیە، سێسەد خەمی ئەوێ کاولەدنیایێ

ئەوە بێجگە لەوەی ئەوە هەر مانگێکی جوانن[1]،

سبەینان گەشن، نیوەڕۆیان لاڵ و پاڵن[2]،

ئەگەر لەبەر ڕشێنەی بارانەی بەهارێ نەبێ و پشووە شەماڵێکو[3] لێ نەدا

بەردەدەنەوە سەری خەجاڵەتێ و تێکڕا دەچنەوە باری فەنایێ!

ئەوە گوڵینە نابێ گلەییان بکەن، هێندەی جوانن،

ئەگەر سەد هێندەی دیکەش جوان بن،

تاقەگوڵێکیش هەیە لە باخی شەددادی،[4]

ساڵێ بەری دوازدەی مانگێ هەر لە مەجازێکیدایێ

هەموو ئێوارە و سبەینان، بولبول لەسەری دەکاتەوە هەرا هەرا و زەنا زەنایێ،

خۆ ئەگەر ئەو (گوڵە)شتان بێتەوە پاڵێ، بە قەولی هەرزەکاران،

بە مەزەبێ جحێڵان، بە شەرعێ مەلایان، بە فتوای قازییان،

---

١- هەر مانگێکی جوانن: مەبەست لە گوڵەباخی بەهارێیە، چونکە تەمەنی کورتە، هەر وەکو فۆلکلۆر دەڵێ: گوڵ عومری حەفتەیەکە، دەورانیش سەردەمێکە.

٢- لاڵ و پاڵن: بێدەنگ کەوتوون، بەسەر یەکدا چوون.

٣- شەماڵێکو: شەماڵێکتان- (و) لە هێندێك بنزاری وەك موکریان و پشدەر، جێناوە بۆ کەسی دووەمی کۆ (گوێگر) و هاوتای (تان)ە. (ئنستیتیوت)

٤- گوڵەکەی باخی شەددادی: لە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا بە تایبەت لەسەری نووسراوە و قسەی دەربارە کراوە.

نابنەوە بەو خاڵەی ئەگەر خوداوەندی میری مەزن، بە دەسەڵاتی خۆی،
دەینەخشاندەوە لەسەر ڕوومەتی شیرین لەیلایێ.
ئەهای گەلۆ، ئەمن سەرگەردانم بۆ وان شەدەشلان، چاو بە کلان
بەر کێلە[1] بە خاڵان، نێو قەد بە دراوان[2]، کلیل بە بەرۆکان[3]
هاوارە لە من، سەد جاران هاوارە، گەلۆۆۆ!!

***

ئەوە خزمینە سەرێ من دەئێشێ، دڵی من ناسەکنێ و،
چەندە لە دەردە و چەندە لە برینە برینە!
زیننەتی لە دنیایەم چن؟! چنارن، پەڵکن[4]، لاولاون،
بە عامیان شەنگەبینە!
باڵداری نێو ئاوانم چن؟! شمقاڕن، شالوورن، کەڵکن[5]،
مراوی سەرکەسك و باڵ بنەوشەیی و، خاسە سینە!
ئەدی خشڵێ ئەوێ کەڵەگەتێ چن؟!
گوارەیە، کرمەکە، تۆقە، تەلەسمە، دەرزییە، قۆیتاسێکە سەر بە گژنیژینە!

---

١- بەرکێلە: بەر گەردن، نێوانی گەردن و مەمکان.
٢- نێو قەد بە دراو: پشتێنی سازکراو بە دراوی کانزایی، قسەی لەسەر کراوە.
٣- کلیل بە بەرۆك: کابانێ ئازوقە بەدەستی ماڵێ، کینایەیە بە کیژی گەورەی ماڵێ، کە کلیلی پاشخانی ئازوخەی دەدرێتە دەست و بەرپرسایەتی لە ئەستۆ دەبێ.
٤- پەڵك: درەختێکە گەڵا شێوە سپیدارییە، دیوی سەرەوەی گەڵاکەی سەوز و دیوی بنەوەی سپییە، گەڵا هەڵم نەدەرە، شێوە ئەرخەوانییە. (ئنستیتیوت)
٥- کەڵك: (سەقاقوش)یشی پێدەگوترێ، باڵدارێکی ئاوییە و لە قاز گەورەترە، دەندووکی درێژە و بەشی ژێرەوەی چۆڵەمە (غەبغەبە)ی هەیە، کە نزیکەی نیو تەنەکە ئاو دەگرێت، بۆ ڕاوکردنی وردە ماسی بەکاری دەهێنێت. (ئنستیتیوت)

ئەوانە هیچیان ناگەنە خاڵێکی ڕەشی عاقرەوی[1]
نێوانێ زەردمەمکان، هەر دەڵێی نەخشە و
وەستا موحەممەدی کۆیە[2] سەروبنی گرتۆتەوە لە زیوینە!
هەر کەسێکی سەر بەو خاڵەی بێنی،
لەبۆ دنیایەی دەبێ بە سفەتێکی چاك و،
لەبۆ قیامەتێشی، پێی قایم دەبێتەوە دینە!
ئەمن حەیفێك و دووسەد مەخابن دەمکوژن بۆ وێ[3] زەردەسمەرێ
ئەگەر لە حەدەحەدی دە نیوەشەوێدا،
بە قەدێکی بڵند و باریك و، بە قۆڵێکی بە بازن و، بە قامکێکی بە ئەنگوستیلە
هەڵدەستێتەوە سەر لانکەی کوڕی و، بە زمانێکی شیرن
لەبۆی دەکاتەوە لایەلایە و دەڵێ لەبۆ نانوی!
دەك ڕەبی بەبێ بابیت گەورە کەم،
بۆ خاتری ئەو موحەممەدەی ئەگەر سەرداره دینە.
هاوارە لە من گەلۆۆۆ

---

١- خاڵی ڕەشی عاقرەوی: لە بەشەکانی دواتری ئەم کتێبەدا بە تایبەت قسەی دەربارە کراوە.

٢- وەستا موحەممەدی کۆیە و میدادی ئەڵمانی و سەردەمی لەدایکبوونی گەلۆی، لە بەشەکانی دواتری ئەم کتێبەدا بە تایبەت نووسینیان لەسەر هەیە و قسەیان لێوە کراوە.

٣- وێ: ئەوێ، ئەو، جێناوی کەسی سێیەمی تاکە بۆ مێیینە و (وی- ئەوی)یش بۆ نێرینە، لە بنزاری موکریان و پشدەردا بەکار دێت. (ئنستیتیوت)

ئەمن سەرگەردانی ئەوان شەدەشلان، چاو بەکلان، هاوارە لە من گەلۆۆۆ.

***

کچ دەڵێ خەمی دە تازەم زۆرن، خەمی دە کۆنم چ نینە!
عەزیزەکەی لە دنیایەم، چ بکەم بە خەمان پێك نایێ!
ئەمن هەڵم دەنایەوە، سەری کۆشکان، شانشینان، وەتاغان، پەنجەران،
هەتاکو پێیدا بێتەوە شیدەتی دە شیبایێ
ئەمن لە لێفە و دۆشەکی نازی بە مەخمەردا دەنووستم
چ بکەم ئەوشۆ لە حەیفێ گولێکی دە گولەمێردانم خەو نایێ.
کوڕ دەڵێ کیژێ سینگت بە من بمێنی، بە تەختی سولەیمان پێغەمبەری[1]
ئەگەر بە حوکمی دێوان بە دیاری دەچوو بۆ چاوی بەڵقیسایێ
قوڵکەی بەر گەردنێت بە من بمێنێ، بە حەوزی شەڕابەن تەهورێ[2]
ئەگەر پیاڵە بەدەستان دەیگێڕن
لەبۆ پیاوچاکان، ئیمانداران، لە ڕۆژەکەی واوەیلایێ
ئەمن لانکێکی دروست دەکەم بۆ ئەسمەرێ، لە دارەکەی دارخورمایێ
وەستایانی بۆ دێنم لە هیندێ،
شاگردانی بۆ دێنم لە دیاربەکرێ، خەلفانی بۆ دێنم لە بەغدایێ

---

١- تەختی سولێمان پێغەمبەر: لە بەشەکانی دواتری ئەم کتێبەدا بە تایبەت نووسین و قسەی لەسەر کراوە.

٢- شەڕابەن تەهور: دەربڕینێکی قورئانییە، بۆ پاداشتی پیاوچاکان، خواردنەوەی خاوێن.

نێو تەختەی بۆ دەکەم لە گوڵێ، لە گوڵە بەڕۆنێ
تەختەی لە دارەکەی دارتوبایێ[1]
ئەمن دەڵێم وەستا، ڕەوارەی لانکێ کورت ببڕەوە،
مەمکی ئەسمەرێ کورتن، تورتن، ناگەنە سەر زاری کۆرپەی
با مەمکۆڵەی ئەزیەت نەدرێن و لێی تێکنەچێ کەلیمەی لایلایێ
ئەهای گەلۆۆۆ، هاوارە لە من،
ئەمن سەرگەردانم بۆ وان شەدەشلان، گەلۆۆۆ.
***
ئەمن بۆت هەڵدەڵێم بە وێ مەحبوبێ، بە وێ ئەسمەرێ
هەنیەی بە من بمێنێ، بە مانگی لە چواردە و پازدان،
زوڵفی بە بەیداخی ڕۆمێ، ئەگەر بە بای شەماڵی دەشەکایەوە
لەسەر قشڵەخانەی دەوڵەتێ
ئەوجار بۆت هەڵدەڵێمەوە، بەوێ بەژن باریکێ، کێل گەردنێ
قۆڵ بە بازنێ، نێوقەد بە دراوێ، بەر کێلە بە خاڵێ،
کلیل بە بەرۆکێ، کەڵەگەتێ
سینگی بە من بمێنێ، بە بەفری کوێستانەکەی برایم جەلالی،
ئەگەر پاشی سێ مانگەی بەهارێ، خۆی حەشار دەدا
لە کوێستانەکەی پیرە کۆسرەتێ
وردە خاڵی بە من بمێنن، بە وەنەوشەی ساوا،
ئەگەر گەردی بەیانی سەری خۆیان دەهێنایەوە دەرێ

---

١- شەجەرە توبا: لە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتێبەدا بە تایبەت قسە و نووسینی لەسەر کراوە.

لە بن کەویلە کەویلکەی[1] بەفریْ، لە دامیْنی ڕنوە بەفران، لە دم ڕووباران،

ئەگەر لەبەر گەرمای نیوەڕۆیە، بەر دەدەنەوە سەری خەجاڵەتیْ

ڕوومەتی بە من بمیْنن، بە سوورە گوڵەکەی هەوەڵی بەهاریْ

ئەگەر دەپشکوت و کەلەلا[2] دەبوو،

لەنگەری دەگرت لەو بەرەوبەری کاولە سۆماییْ

قامکی[3] بە من بمیْنن، بە میدادی ئەڵمانیان[4]

ئەگەر مەلا عەبدوڵڵای کۆیە، پیْی دەکیْشیْتەوە نوختە و میل[5] و خەتیْ

لیْوی بە من بمیْنن، بە پەڕی سوورە گوڵان، ددانی بە مرواری،

کەپووی بە فندقی، چاوی بە گەلاویْژەکەی بەیانیان،

برۆی بە پەڕی کەتیْ

گەردنی بە من بمیْنیْ، بە گەردنی خاسە کەوی بەهاریْ

ئەگەر دیْتەوە لە گەرمیْنی و خۆی هەڵدەداتەوە بۆ تیلەی کویْستانیْ و

هەڵدەنیشیْ لەسەر گویْیە بەردی و دەڕیْژیْ خاڵ و خەتیْ

ئەمن بانگیْکم وەبەر خوداوەندی میری مەزن

---

١- کەویلکەی بەفریْ: پەڵە بەفری چوکەڵەی دامیْنی ڕنوە بەفران.

٢- کەلەلا: بڕشت لیْ بڕاو، بیْ تین و تاقەت، کەوتوو لە بیْ هیْزیان. (ئنستیتیوت)

٣- قامك: ئەنگوست، پەنجە.

٤- میدادی ئەڵمانیان: لە بەشەکانی داهاتووی ئەم کتیْبەدا، لەگەڵ شەرحی وەستا موحەممەدی کۆیە شەرحی لیْ کراوە.

٥- میل: خەتی ڕاکشاوی ستوونی، کلچیْوك، هەر وەکو (شوکری فەزلی)ی شاعیر گوتوویە:

حەیفە چاویْك کە جەفا کوڵەوەژی تیْدەشکاند

تۆ بە کلچیْوکی وەفایی، عەینی گەلاویْژی نەکەی!

بانگی دیکەم وەبەر موحەممەدەل موستەفایە
ئەگەر ڕۆژێ واوەیلایێ، دەکاتەوە شەفاعەتێ
بانگی سێیمینم وەبەر ئەو مەلا و فەقێیانەیە،
ئەگەر بە نوکی قەڵەمێ ناهێڵن دینی ئیسلامێ بفەوتێ!
دە وەرە دوو ماچانم دەیە، لە گەردنێ زەرد و خاڵی ڕەشی ڕوومەتێ
ئەمە دەکەین گەمێ، گەپێ، لەگەڵ سوحبەتێ
خودا بەخشندەیە لەبۆ ڕۆژەکەی ئاخیرەتێ!
هاوارە لە من گەلۆۆ،
ئەمن سەرگەردانم بۆ وان شەدەشلان،
شل و ملان، چاو بە کلان، نێو قەد بە دراوان، ئەهای گەلۆۆۆۆ[1].

---

١- هەر چەندە ئەم تێکستی (گەلۆ)یەی، لە کۆی چەند گەلۆیەك ساز کردۆتەوە، بەڵام بە داخەوە مامۆستا زیاد ئاماژەی بە سەرچاوەکان نەداوە. (ئنستیتیوت)

# گەلۆ- لێکدانەوەی هێندێك لە زاراوە و دەستەواژەکان

## غەمێ لە دڵم پەڕاگەندە:

هەر وەکو مێژوو بۆمان دەگێڕێتەوە، یان بۆ خۆمان بیستومانە و دیتوومانە، هەتا ئێستێشی دەگەڵدابێ، کوردستان هەمیشە و تێکڕا هەر مەیدانێ شەڕی ئەستەم و، پێکدادان و ناخۆشییان بووە، وڵات وێران و کوردیش هەمیشە سەرگەردان و باجدەری دەرهاویشتەی ئەنجامی هەرایەکان بووە. هەر ئەو هۆیەش بووە ئەگەر دڵی دانەری بابەتەکەمانی کردووە بە کانگای هەژاندنێ.

بێگومان هونەرمەندانی کوردیش بەشێکی گرینگی نێو باجدەرانی گشتی ئەم کارەساتانە بوون، دیارە ئەم کوێرەوەریی ژیانەش، لە شیعر و گوتە و پەند و باوی کۆمەڵگای کوردەواریدا، بە ڕوونی بوونە ئاوێنەی دیاری ڕووداوەکان و بوارە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵایەتی و...هتد، هەر وەکو لەم شیعرەی بێخودی شاعیردا خۆی دەنوێنێ:

ئــــەوی دانایــــە جــــەرگی وەك پەڵاســــە
ئــــەوی نادانــــە نازانــــێ چ باســــە![1]

بەڵام ئێمە لێرەدا تەنیا مەبەستمان لایەنی وێژەییە و لەوێشدا پەخشانە شیعری گەلۆیەکەمان و بەرادەرە هاوتەمەنەکانییەتی لە بواری وشە و ئاوازی ڕەسەنی کوردیدا.

---

١- دیوانی بێخود، ئامادەکردنی محەممەدی مەلا کەریم، چ(سلمان الاعظمي)، بەغدا، ١٩٧٠.

گەلی دۆستان و برادەران، ئاشکرا دیارە سەرڕای ئەم هەموو گرفتانە، هەر جارێکی کەمترین دەرفەتی بێ شەڕیی و، ئاشتی و ئارامبەخش، بۆ هەر تاکێکی هونەرمەندی کوردی هەر جۆرە هونەرێکی ڕەخسابێ، ئەوە بە گورجی و بە ڕاددێکی زۆر سەرکەوتوانە، کرداری لەگەڵ هونەرەکەی خۆی بە چاکی و باشی و بەرپرسیارانە ئەنجامداوە، هەر وەکو ئەوەی هەستی بەوە کردبێ کە ئەم بابەتەی هەیەتی و گوتویەتی و دەیڵێت، سامان و هونەری نەتەوێکی گەلێك هەژار و ژێردەستە و زۆر لێکراوە، جا لەبەر ئەوەی پێویستە بمێنێ و بگوترێ و بگوترێتەوە و گەشە و پەرەی پێ بدرێ و بڵاو ببێ و نەکەوێتە بن لیتەی نیشتووی لافاوی ڕابردوویەتییەوە، بۆ ئەوەی هەتا دەما و دەم بمێنێ و خاوێن بکرێتەوە و بە باوەشێنی خۆشەویستی و پێویستییە گەش بکرێتەوە و ببێتە دیمەنی هۆی چاو پێڕوونکردنەوەی، هەتا لە کاتی ڕانانێ بابەتاندا، وەکو کاڵای نایابی کوردان لەسەر شانۆی نیشاندانێ نایابە کاڵایاندا، نیشانی دۆستان و نەتەویان[1] بدرێ و کوردیش شانازییانی پێوە بکەن و بە توانجەوە بڵێن: "دەبا دوژمنانی دزێوویست و بەدکاریش، هەر ببۆڵێنن و چاویان بەرایی نەدا بیاننوڕنێ!!!"

سروشتی کوردستانێ بە هەر چوار وەرزەکانییەوە، بە تێکڕا و بە تەنێش هەر وەرزێك تایبەتمەندییەکەی لە سێ مانگی تەمەنی خۆیدا جوانییەکەی بیر و هۆشی مرۆڤی کوردی بۆ کار و ئاکاری دروست و

---

١- نەتەویان: دوژمنان، کۆی (نەتەوی)یە، زۆر نزیکە لە وشەی (نەتەوێ)وە هاتبێ، کە بە مانای (نەتهەوێ، گەرەکت نەبێ) دێت .

جوانییـان هەژانـدووە، هـەر وەکـو لـە (گەلۆ)یەکـەمان و زۆری دیکـەدا وەدەردەکەوێ.

لــە ئێســتێی ســەر وەدەرنانــێ گەلۆیەکەمانـدا، کـات بـەهارێکی ڕازاوەیـە، شـوێنیش دەڤەری (ورمـێ) و ئەمبـەر و ئەوبـەری قەشـەنگی (سۆما)یە. گەلۆبێژەکەشمان، وەکو گـەنجێکی خوێنـدەواری سـەردەمی خۆی و دانەری وشە و ئاوازی ڕەسـەن و چڕینی گەلۆیەکـەمان، دیـارە ئەو کەسە لە مەلایەکی بیرتیژ و هۆشمەندی ئاشقی دروست[1] بەولاوە، هیچ جۆرە کەسێکی دیکە بەدی ناکرێ، کە دەربارەی جوانییـەکان و مرۆڤـان و ئایینـەوە، ئەوەنـدە زێـدە کـارگوزاری فەرمانـەکانی خـودای مەزن و جێبـەجێکارییان بووبێ. ئـەو کەسێکی ئاشـقە دروست بـووە، وەکو ئەشقەتییەکەی نالی کە دەڵێ:

ئاشــقی ســونعی حــەقم، قوربــانی ڕەنگــی قــودرەتم
چاوی ماوی، خاڵی شین، کوڵمی سپی، زوڵفی سیا[2]

گەلۆدانەر، ئەگەر هەر جۆرە کەسێك بووبی، هەژار، یـان دەوڵەمەنـد. ئەو، ئێستی چۆتە نێو چوارچێوەی ئەندێشێکییەوە، کە بە هیچ جۆرە سـامانێکی ئـەم جیهانــەی ناگۆڕێتــەوە. ئـەو، لـەم کاتـە خۆشـەیدا، تەنانەت خودی خۆی و ناوی خۆیشی لەبیر چۆتەوە، ئەو، ئێستێ لە ئەشـقی دروسـتدا تواوەتـەوە، سـەرجەمی خەمـەکانی نێـو دڵەکـەی جارانی و ئێستێشی، هەر هەموویان کۆن و نوێ تێکڕایان پەڕاگەندە

---

[1]- دروست: حەقیقی، لێرەوە و لـە زۆر شـوێنی دیکـەی ئـەم کتێبـەدا، ئـەم وشـەیە بەو مانایە بەکاربراوە. (ئنستیتیوت)

[2]- دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو.

بوون و تەواوێکی چاکی لێ وەدوورکەوتوونەوە و بێ سەر و شوێن و شوێنبزر و بابردە و سەرەنگرێ بەدوای یەکدیدا، بە دۆڵ و تەلان و بە شیواندا لە چاوان بزر بوون.

بێگومان، دیارە ئێستێ خاوەن گەلۆ، کەسێکی دڵخۆشە، کە لەو کاتەیدا بە دڵێکی زێدە گەشاوە، بێخەم و دوور لە ئاڵۆزییە بیر و بۆچوونان، داهاتۆتە سەر داڕشتنێ وشە و ڕستە و ئاوازی بەسۆزی مەقامی گەلۆی و کۆپلەکانی، هەتا بە گوێرەی ویست و ڕێکوپێك سەرەتایەکی گونجاوی نێوەرۆك تێر و پڕی مانادار و، کۆتاییەکی پڕ لە فەرامۆشیانی لێ بهێنێتە بەرهەم، ئاشکرایە ئەوەش لەبەر ئەوەی لە کوردەواریدا بە دەگمەن هەڵکەوتووە، کە لەو سەردەمەیدا نووسەرێکی وێژەیی، ئەوەندە کاتی ئاسوودەی بۆ ڕەخسابێ، ئەگەر بە دڵێکی هێندە خۆشەوە دەستی بە نووسینێ، یان چڕینێ هەر بابەتێکی بێئاخ و ئۆفی ئەوەند گرینگی وێژەیی کردبێ!!

دانەری پەخشانە شیعرەکەی، کارکردە و زانستانە توانیوتی هێندە گونجاوانە و دروستانە کۆتایی ویستراو بۆ بابەتەکەی بڕەخسێنێ، کە لە نێو دڵی گوێگران و خوێنەراندا، تۆوی ئاسوودەییە چەکەرە پێ بکات و سەری ئارەزوانیان پێ ڕابژێنێ و لە دواتریشدا گوێگران بە گۆیندەکەیان بڵێن: "هەزار ڕەحمەت لەو داك و بابەی لێیان بووی، بۆ خۆت و گوتنێت!"

گەلۆ، زۆر بە ڕوونی دیارە ئەگەر ئەم بەرهەمە بەپێزە، چووزەرەکردووی نێو مەزرای ئیشقێکی دروستی پەندخواردووە! لێرەدا خاوەن گەلۆ، چاکی هەست بەوە کردووە، کە ئەم خۆشییە هەتا سەر نییە و، لە دوای ئەم خۆشییەی، خۆشییەکی دیکەی خۆش یان

خۆشتری بۆ نایەتە ئاراوە، بەڵکو بۆ ئەو بیرەی چووە، کە لە دوای ئەم خۆشییەی، ناخۆشییەکی چاوەڕێ نەکراو، بەربینگی پێدەگرێ[1] و ئەم خۆشییەی نامێنێ، چونکە ئەوەی باش زانیوە ئەگەر "زوو لە دڵ دەڕوا سەیر و سەفا" و جا لەبەر ئەو هۆیەی ویستویەتی لە نێو ئەم ئاڵوگۆڕێ ژیانە جەنجاڵەیدا، دوور بکەوێتەوە و هەر چەندێکیش بۆی بکرێ، خۆی لە نێو ئەو خۆشییەیدا بهێڵێتەوە، چونکە جارێکی دیکە، ئەم خەیاڵە خۆشەی بۆ هەڵناکەوێتەوە!

دیارە کە ئەم کێشە هەمەجۆر و زۆرانەی نێو کۆمەڵگای کوردستانیش، هەموویان لە زۆر دێرینەوە هەر لەلایەن ڕابەرانی ئایینەوە (موفتی، قازی، مەلا...) چارەسەر کراون، بەڵام مامۆستا ئێستێ و لەو کاتەیدا ئەم دادپەروەریەی ناکا، هەر چەندە کاری پێویستی سەر شانی خۆی بووە، بەڵام لەبەر ئەو هۆیەی کە باسمان کرد، بە بێنوی جۆراوجۆر، دادوەری دیکەی نیشانداون و لە خۆی دوور خستوونەوە، بۆ ئەوەی کە خۆی تووشی ئەندێشە پچڕانێ نەکا، نەکو جارێکی دیکە، ئەم خەیاڵەی بۆ ڕێك نەکرێتەوە، هەر وەکو ئەم پەندە، کە کوڕە لاوە کوردێك بە کیژە خۆشەویستەکەی دەڵێ:

دەترسم بمرم نەتبینمەوە
بە جوانەمەرگی سەر بنێمەوە

---

[1]- بەربینگ پێگرتن: یەخە پێگرتن، ڕێ پێگرتن، شەڕ پێ فرۆشتن. (ننستیتیوت)

یان وەکو ئەم چەندوکە دێڕە شیعرە حەسرەتییەی کە لە گۆڕستانی سەیوانی سلێمانی، لەسەر کێلی گۆڕی مستەفا پاشای یامولکی نووسراوە:

دەترسم بمرم ئەی وەتەن
نەبینم بەختیاریی تۆ
بنووسن با لەسەر قەبرم
وەتەن غەمگین و من غەمگین[1]

---

١- ئەم دێڕە شیعرە، لەسەر کێلی مستەفا پاشای یامولکی، لە گۆڕستانی سەیوان، نووسراوە. ساڵی ١٩٥٧ نوسیومەتەوە و لە کەشکۆڵێکدا یاداشتم کردووە، لەو کاتەشەوە لەبەرم کردووە و هەمیشەش لەنێو دڵ و لەبەر چاوانم بووە.

## شێرن لەیلا:

وشەی شیرن، ناوی تامی جۆرە خواردنێکە لە نێو خواردنەکاندا، کە یەکەم خواردنێ هاتنە نێو ژیانی جیهانێمانە، کە بە چەشنێ (شیرە). شیرن وەکو وشە، هێندێك جاران بە گوێرەی شوێن ئاوەڵناوە، بەلاّم وەکو دروست، هەر وەکو گوتمان، ناوی جۆرە تامێکە، دیارە وەکو خوازراویش ناوی ئافرەتانە.

لە زووتردا ئەم وشەیە (شیرن)، هەر وەکو ئێستێ لێرەدا نووسیومانە، بەکارهاتووە، بەلاّم لەم دواییانەدا گۆڕانی بەسەردا هێندراوە و لە (شیرن)ی ناوەوە بووە بە (شیرن– شیرین)ی ئاوەڵناو. ئەم وشەیە، بە هەردوو جۆرەکانییەوە، لە سەردەمی کۆن و ئێستێشدا، ناوێکی زێدە کارای بەشێکی زۆری ئافرەتانی کورد بووە و لە ئێستاشدا بوونیان هەر دیار و درەوشاوەیە و لەگەڵ کۆمەڵێك ناوی دیکەی دەستە خوشکی خۆیان وەکو ناوەکانی (پیرۆز، خانم، خاتوون، ناسك و نازدار، باش خۆیان لە وەبنکەوتنێ ناوە بێگانەکان، پاراستووە.

ناوەکانی (شیرن، شیرین) بە هەردووك شێوەکانییەوە لە کوردستانێدا لە نێو ناوان، ڕێز و پایەی خۆیان لە دەست نەداوە و هەر بەرز و درەوشاوە لە نێو داستانە کوردییەکاندا دیارن. بۆ نموونە شیرن ناوێك، زێدە بەناوبانگ و دیارە و داستانێکی زێدە گرنگی تراژیدیی شوێنەوار درەوشاوەی بەجێهێشتووە، لە ژیانێشدا جوانێتییەکەی بۆ خودی خۆی بووە بە مایەی چەرمەسەرییە و سەرتاپای تێکڕای ژیانێ خۆی و دەوروبەر و کەسانی دیکە، هەتا بە کوشتنێ خۆی بە دەستی خۆی، تراژیدیایەکی چیرۆك ئامێزی گرنگ

و کەموێنـەی بـۆ مێـژووی ئـەدەبی کوردی تۆمار کـردووە، ئـەم شـیرنە ژیان بە کێشەیە، (شیرنی ئەرمـەن) بەناوبانگ بووە و ژنـی خوسـرەوی پـەروێز بـووە، کـە خوسـرەو، شـای (کـەیان)یان بـووە و، لـە دەڤـەری کرماشانێدا نیشتەجێ بووە.

شـیرن، بـە ژنییـەتی ئاشـقی فـەرهادی پەیکـەرتاش بـووە، کـە ئەنجامەکـەی بـە کوشـتنێ خـۆی و خەسـرەوی مێـردی و فـەرهادی پەیکـــەرتاش کۆتـــایی هـــاتووە، بـــە پیرێژنـــە درۆزنـــە کـــردار شەیتانییەکەشەوە!

درووود بۆ گیانی پاکی ئەحمەدی موختاری جاف، کە مافی ڕەوای داوەتە داستانەکە و، بەرز و بەڕێز نرخاندوویەتی و گوتوویە:

بێستوون ئێستەش کە وەختێ لالەی لێ سەوز ئەبێ
باسی خوێنی دیدە و داخی دڵی فەرهاد ئەکا...[1]

گوڵاڵــەی بێســتوون، ئێســتا بــەهاران
ئــەڵێن ماجــەرای فــەرهاد و شــیرین[2]

وشەی (لەیلا)ش، دیارە وشـەیەکی عەرەبییە و لـە بنەچەدا لـە ڕەنگـی تاریکی شەوانەدا هاتووە. (لیل) ناوێکی دیـاری نێـو سـەرجەمێ ناوەکـانی ڕەگەزی مێینەی خۆرهـەڵاتێ نێوەڕاسـتە، کـە هـەموو نـاو لەیلایـەکیش، لـە لەیلای عەرەبانەوە وەرگیراوە، کـە ئـەویش نـاوی کـیژە ڕەنـگ ئەسـمـەرێکی دەشـتەکیی ڕەشماڵنشـینی عـەرەب بـووە، کـوڕە عـەرەبێکی گـەنج ئاشـقی

---

١- مێـژووی ئـەدەبی کـوردی، عەلائـەدین سـوجادی، چـاپی دووەم، چ(مـەعاریف)، بەغدا، ١٩٧١.

٢- مێژووی ئەدەبی کوردی، سەرچاوەی پێشوو.

ئەو کیژە بووە و لە ئەنجامی بۆ یەکدی نەبوونێ، کوڕە شێت بووە و بەرێ خۆی داوەتە نێو بیابان و دەشت و کێوان، وشەی (مەجنوون)ی زمانی عارەبیش، بە مانای شێت دێت، ئەم ئاوەڵناوەش بۆ ئەم ئاشقە، بووە بە ناوێکی بەربڵاوی کوڕە ئەشقەکەی و، ناوە ڕەسەنەکەی، وە بن خۆی داوە، کە عەرەب پێیان گوتووە (قەیس).

ئەم داستانە، داستانێکی ناسراوە و ڕۆشنبیر و شاعیرانی عەرەب و کورد و فارس، لە سەردەمانی کۆن و نوێدا، لە شیعرەکانیاندا وەکو چیرۆك و بەسەرهاتی خۆرهەڵاتی نێوەڕاستێ، تۆماریان کردووە و کردوویانە بە داستانێکی جیهانی.

ماڵێ بابی لەیلێ، وەکو ئاژەڵدار گەرمێن و کوێستانی کردووە، جا مەجنوونی ئاشقە لەیل، لەم گەرمێن و کوێستانکردنەیدا، بەوەی دڵخۆش بووە، ئەگەر لەسەر ڕێگایە ڕۆیشتنێ و هاتنەوێ ماڵێ بابی لەیلێ بکەوێ، بەڵکو لە ساڵێکیدا دوو جاری بەهاران و پاییزان، سەگەکەی ماڵێ بابی لەیلێ، لەسەر هەردووك چاوی چاوان دابنێ! هەر وەکو میرزا عەبدولڕەحیمی سابڵاخی (وەفایی)ی شاعیر، ئەم ئەشقە گڕسەندووەی، وەستایانە شیعراندووە، کە دەڵێ:

سەگەکەی ڕێبازی لەیلێ، وەرە سەر دوو چاوی مەجنوون
دنیام ئەو ڕۆژە لێ ڕوونە، خاکی بەر پێی ئاشنا بم![1]

گەلی دۆستان، ئەم دوو ناوەی (شیرین و لەیلا)یە، لەبەر جوانییەتییەکەیان و داستانە بەناوبانگەکانیان، هەردووکیان هاتوونە

---

١- دیوانی وەفایی، کۆکردنەوەی محەممەد عەلی قەرەداغی، چاپی دووەم، چ(کۆڕ)، بەغدا، ١٩٨٤.

نێو پەخشانە شیعری گەلۆیەکەمانەوە و قەشەنگتر و درەوشاوەتریان کردووە، بەم کارەش جوانییە خۆشەویستەکەی دانەری گەلۆیەکەمان، هێندەی کۆی جوانییەتییە هەردووک (شیرین و لەیلا)یە، دوو هێندەی خۆی جوانتر و درەوشاوەتر کردووە.

بێگومان بە لابردنی پیتی (و)ی ئامرازی پەیوەندیی نێوان هەردووک ناوەکانی شیرین و لەیلایە، وشەی شیرین دەبێتە ئاوەڵناوی لەیلایە، کە لەیلاش ناوێکی وەرگیراوی خۆشەویستەکەی دانەری دەقەکەیە و، بە تێکەڵکردنێ جوانییەکانی شیرین و لەیلایەش، جۆرە جوانییەك هاتۆتە ئاراوە، کە ئەم جۆرە جوانییەش لە خۆشەویستەکەی دانەری دەقەکەماندا، بەرجەستە بووە و بۆتە شاجوان و، هەناوی دانەری هەژاندووە، ئەم هەژاندنەیش، بۆتە هۆی سەرهەڵدانی دەقی ناسك و نازداری گەلۆیەکەمان.

گەلۆ، ئەگەر ئەو جۆرە کار و کردەوانەش نەبووبایە، دیارە ئەم بابەتە زێدەخۆشەش دروست نەدەبوو، واتە ئەگەر ئەوەیان نەبووبایە، ئەمەیان نەدەبوو، وەکو ئەوەی کە مەرەکەب نەبێ، پێنووس نابێ، دیارە بە پێچەوانەشەوە کارەکە هەر بەمجۆرەیە.

(مەحوی)ی شاعیر بە شێوەیەکی زۆر قوڵ و زانستانە ئەم بابەتەی ڕوون کردۆتەوە، کە دەڵێ: ئەگەر مەجنوون نەبووبا، ئەوە لەیلایەکی ڕەشتاڵەی بیابانیی حوشتر لەوەڕێن، شایانی ئەو هەموو ناو و ناوبانگەی نەدەبوو. هەر وەکو ئەگەر شیرنیش نەبووبایە، کەسێکی وەکو فەرهادی، بێجگە لە وەستایەکی بەردهەڵقەنی پەیکەر دروستکاری ئاسایی، هیچی دیکە نەدەبوو! جا لەبەر ئەوەی لەیلاش

و فـــەرهادیش، هـــەتا ڕۆژی حەشـــریٚ پێویســـتە هـــەر ســـتایش و خزمەتگوزارییە مەجنوونیٚ و شیرنیٚ بکەن.

ئەگەر لەیلا، ئەگەر فەرهاد، هەتا حەشر هەر ببن مەجنوون
لە یومنی[1] عیشقە، فەیزی حوسنە، وا بەم ڕەتبە نائیل بوون[2]

دەکـــەن ڕەشـــتاڵەیەکی دەشـــتەکی باســـی لەگـــەڵ شـــیرین
دەبـــەن بەردەهەڵکـــەنێکی کێـــزری[3] نـــاوی لەگـــەڵ مـــەجنوون[4]

---

١- یومن: پیت و بەرەکەت، بڕوانە: شەرحی دیوانی مەحوی، مەلا عەبدولکەریمی موردەڕیس و مەحەمەدی مەلا کەریم، چ(کۆڕ)، بەغدا، ١٩٨٧. (ئنستیتیوت).

٢- دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو.

٣- کێزری: هەڵەشە و خودسەر، بڕوانە: شەرحی دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو. (ئنستیتیوت).

٤- دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو.

## ساڵێ دوو جاران دەدرێیەوە لە قونێ ئەوێ کاولەدنیایێ:

گەلی دۆست و برادەران و گەلۆدۆست، لە لێکدانەوێ دەربڕینێ دەستەواژێ (ساڵێ دوو جاران دەدرێیەوە لە قونێ ئەوێ کاولەدنیایێ)یەیدا، وا دەردەکەوێ کە ئەو دەربڕینە، نابێ بەو شێوەی ئەگەر وەکو خۆی گوتراوە و نووسراوە، دروستانە لێك بدرێتەوە، بەڵکو لێکدانەوەی دروست ئەوەیە، ئەگەر بە شێوەی خوازەیی هەڵبسەنگێندرێ و ئەمدیوە و ئەودیوی پێ بکرێ. ئەمەش لەبەر ئەوەی ڕووەکی بیزایە، بێجگە لە ئاکاری سروشتی گوڵانەی خۆی وەکو گوڵ، چەند جۆرە بەکارهێنانی دیکەشی هەن، وەکو ئەوەی کە بە چێشت لێ دەندرێت و بە کاڵیش دەخورێت، لەگەڵ دروستکردنی (شیرێژ)یش، ورد دەکرێت و تێکهەڵدەدرێت، بەم تێکەڵکردنەش تام و بۆنی شیرێژەکە خۆشتر دەبێت.

بێجگە لەم بەکارهێنانەش، خواردنەکەی، چەوری نێو لەشی مرۆڤ دەتوێنێتەوە و ئارامییە دەبەخشێت. بە هۆی ئەم سوودانەشیەوە، بێگومان دیارە مرۆڤ، ئەم ڕووەکەی لە ئەوانی دیکە پتر بەکار هێناوە و کەڵکی زۆری لێ وەرگرتوون.

وەکو قەبارە و پۆزاییش، بیزا، ڕووەکێکی مامنێوەنجییە و بەرز نییە، گوڵێکی چکۆلەی شینی ئاماڵ سپاتی هەیە، ئەو گوڵانە لە کۆتایی تەمەنیاندا، نێرتکەکەیان دەبێ بە تۆو، تۆوەکەش بە ڕیشاڵ پێدەگات و دواتر هەڵدەوەرێ و ساڵی داهاتوو دەڕوێتەوە. بیزا، لەبەر چڕی و پڕی و شێوە دەوەنییەکەی، پێی دەگوترێ (قۆپەن)، ئەم

ناوەش لەبەر ئەوەیە، چونکە تۆپەڵێکی پێکەوە بەندی وەکو (گێزەرەکێویلە)ی، دەنکەکانی بە یەکدییەوە بەندن.

لە ڕستە و دەربڕینی (ساڵێ دوو جاران دەدرێیەوە لە قونێ...)دا، ژمارەی دوو جاران کەمترە لە چەندەی جۆری بەکارهێنانەکانی سەرجەمی جەستەی ڕووەکی بیزایە، بۆ بەکارهێنانێ بەرژەوەندییەتییە مرۆڤان، وەکو کەڵك لێوەرگرتن پترن لەو ژمارەیەی بۆی گوتراوە، بەڵام وەکو زمانەوانی و یاسای ڕەوانبێژی، بەکارهێنانی کەم لەبریی زۆر و، زۆریش لەبریی کەم، دروست و گونجاوە، ئەگەر زێدەڕۆیی زۆری تێدا نەکرێ!

گەلۆویستانی بەڕێز، لە نێو کوردەواریدا، شەق تێهەڵدان کارێکی نەشیاوی سووکایەتییە، وەکو نەریتیش وا باوە، کە شەق پتر لە بەشی دواوەی جەستە هەڵدەدرێ، ئەم کارەش بێجگە لە دەرکردن و نەگەرەکییە بۆ لە خۆ دوورخستنەوەوێش کاری پێدەکرێ، وەکو دەڵێن: هەیدێ !

دیارە، دانەرە دەقی گەلۆیەکەمان، لەم دەستەواژەیدا، ڕووەکی بیزایەی وەکو هەموو گوڵەکانی دیکە، گیانی مرۆڤیی وەبەرناوە، لە مرۆڤێشدا باری لای پشتەوەی لەشی لە پشتێن و نێوەڕاست و بەرەو خوارێ هەتا سەر ڕەفیسکان[1]، وەکو بەکارهێنانێ زۆران لە بریی کەمان، پێیدەگوترێ (قون)، کە هەردوو لاسمت و ڕانەکان دەگرێتەوە، بۆ پتر ڕوونکردنەوەش، هەر وەکو مرۆڤی (قونەستوور)یان وەکو زاراوەی سولەیمانییە کە دەگوترێ (قنگ زل)، دیارە ئەم دەستەواژە و

---

١- ڕەفیسك: دیوی دوایەی ئەژنۆ.

دەربڕینانەش، قەڵەوی یان پان و پۆڕی و گەورەییە جەستەی مرۆڤی دەگرێتەوە، دەربڕینی کاولەدنیایەش، بە مەبەستی تەمەنی درێژی دنیای پڕ ناخۆشییان دێت.

بە کورتییەکەی، دەربڕینی سەرباسەکەمان، ئەوەیە، کە کۆمەڵێ گوڵەکان، بە گوڵی بیزایە دەڵێن: هەر یەکێك لە ئێمە بۆ تەنیا تاکە مەبەستێکی بەکار دەهێندرێت و مرۆڤ کاری خۆیمان پێ ئەنجام دەدا، بەڵام تۆی بیزا، زۆر پتر لە ئێمە لە لایەن مرۆڤانەوە بەکاردەهێندرێی و ئازار دەدرێی، جا لەبەر ئەوەی دەبوو ئەتۆ زۆر زووتر لە مە، ئامادەی ئەم بەربەرەکانێکردنەی بووبای، نەکو بەمجۆرەی ئێستێ، کە بەبێ باکی پاڵت لێداوەتەوە و تەنانەت وەکو دەڵێن: (مێشت لێ میوان نییە)، بەڵام لە کوینە، ئەگەر بیزا خۆی وا نیشان دابێ و ئەو کارەی زۆر بەپێویست نەزانیبێ! جا لێرەدا زۆر وێدەچێ گوڵەکان هەر لەسەر قسەکەی خۆیان ڕۆیشتوون و لە کارەکەیان بەردەوام بوون و بە بۆڵەبۆڵەوە گوتویانە:

بیزا، خۆ هەر لە دێرینەوە و لەوەتی دنیا و ئێمە و مرۆڤ هەین، ئەم کێشە هەر هەیە و نەبڕاوەتەوە، دە بیزا، هەستە وەرە لەگەڵمان و بە پێشمان کەوە، با بڕۆین و ئەو کارەی بە مەلای و بە شەرعێ ئیسلامێ یەکلایی بکەینەوە و لە خۆمان تێبگەین و کۆتاییەی پێ بێنین!

گەلۆییانی ئازیز و، گەلۆ، جا لەبەر ئەوەی باسی پیرەدنیایێ هاتۆتە گۆڕێ، ئەم شیعرە مانا پڕ بە پێستەی پیرەدنیایەی (حەمدی)ی شاعیرم هاتەوە یاد، کە لەگەڵ باسەکەماندا بەگونجاوی

دێتەوە، کە پێمان دەڵێ: دنیا هەر چەندە ئەگەر پیرە، بەڵام ئەوەندەش منداڵە و بە کێشە و ئاڵۆزە، گوزەرانی لەگەڵ بەڕێوە ناچێ[1]:

ئەگەرچی پیرە دنیا، سەیر ئەکەی هێشتاکو منداڵە
وەکو میوەی شەرابردوو[2]، پزیوە ڕەنگی هەر کاڵە![3]

## سەخرەتوڵڵا:

لەبەر ئەوەی ئەم تووکە[4] لە سەرجەمی بابەتەکەیدا بۆ هەرسێك دادوەرەکان، وەکو یەکدی سێبارە بۆتەوە و کەمێکیشی داپۆشراوی و نادیاری لەسەرە، بە پێویستم زانی ئەگەر بەکورتیش بێ، هێندێکی ڕوونکردنەوە لەسەر بخەمە پێش چاوی خوێنەران.

لە گوتەی "بە پرد و پێناومان بی ڕۆژبازاڕی قیامەتێ
ئەگەر خودا دەکا دیوانێ و تەرازوو دادەندرێ و
خێر و شەڕ بەش دەکرێن لەسەر بەردی سەخرەتوڵڵایە"دا،

---

١- چاوپێکەوتن لەگەڵ مامۆستا عەبدوڵڵای حەسەنزادە، دەربارەی ڕووەکی بیزا و چەند بابەتێکی دیکە.

٢- شەرا: نەخۆشییەکی کشتوکاڵییە، تووشی میوەی دەبێ، لە ڕواڵەتدا میوەکە ڕەنگی وەکو پێگەیشتبێ وایە، بەڵام تامەکەی وەك میوەی پێنەگەیشتوو ناخۆش و ترش و تفت و تاڵە و هەر بەو جۆرەش دەمێنێتەوە و پێ ناگا، هەتا دەڕزێ و دەوەرێ.

٣- دیوانی حەمدی، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤١.

٤- تووك: دوعای ڕەش و خراپ. (ئنستیتیوت).

دەردەکەوێ ئەگەر کۆمەڵی گولان، زۆریان بە جوانییەتییە خۆیان نازیوە و هیچ کەس و شتێکیان لە خۆیان بۆ پلەی یەکەمیە جوانییەتییە، بە شیاوتر نەزانیوە و، لە کنیشیان وا بووە، ئەگەر لەو بارەیەوە لەگەڵ هەر جۆرە جوانێکیدا بکەونە ڕکەبەرییە، بێگومان سەرکەوتنێ وەدەست دەهێنن، چونکە ئەوان خۆیان بە جوانترین ئافەریدەی خودای زانیوە، بەڵام دیارە گومانی زۆریان لە دادوەرەکان هەبووە، ئەگەر وەکو دروست دادوەرییەکەیان بۆ یەکلاناکەنەوە، لەوەش دەترسێن دادوەرەکان لایەنگیرییە بەرابەرەکەیان بکەن، ئەویش لەبەر ئەوەی دادوەری یەکەم، لە ڕەگەزی مرۆڤە و زۆر وێدەچێ ئەگەر لایەنگیرییە هاوڕەگەزەکەی خۆی بکا، بەڵام دادوەرەکانی دیکە، بۆ هەردوو لایان هەر وەکو یەکدین و هیچیان لە خۆیان نین، هەر لەبەر ئەو مەترسییەش بووە ئەگەر بەرەو ڕووی دادوەرەکانیان لە خوای پاڕاونەوە، کە دادوەرەکان، ئەگەر دادەکەیان خەراپ ئەنجام بدەن، خوا بیانکا بەو پردەی کە لە دواڕۆژێ دوای مردنێدا بەسەر ئاوری دۆزەخێدا ڕاهێڵدراوە و خەڵکی بە کۆمەڵ بەسەریدا دەپەڕنەوە، یان ئەگەر نا، ئەوە گوناهەکانیان هەموو بکەونە سەر ئەستۆی دادوەرەکان و لەسەر ئەو پردەی، سەری خۆیان سەرەودەر نەکەن، بکەونە نێو ئەو ئاورە گڕدارە بە گڕەپێچەیەوە، ئەگەر فریشتە زەبانییەکان[1] بە هەمیشەیی و بێ پسانەوە ئاگرەکەی هەر خۆش و خۆشتر دەکەن!

---

١- زەبانییە: ئەو فریشتانەن کە ئاوری دۆزەخ خۆش دەکەن.

وشـەی پێنـاو (لـەباتی)، ڕانـاوە، بـە مانـای ئەگـەر ئێمـە بـە هـۆی گوناهەکانمانەوە ببین بە پردی ئەمبەرەو بەری سەر ئاگرەکەی، یاخوا ئێـوە بـبن بـەو پـردە و سـەرجەم خـەڵك و ئێمـەش بەسـەر ئێـوەدا بپەڕینـەوە، خـۆ ئەگـەر نەشـبن بـەو پـردە، ئـەوە ئێـوە بـە گوناهـەکانی ئێمەوە لەسەر ئەو پردەی دەرباز نەبن و تێکڕا و وێکڕا بکەونە خوارێ و لە ئاورەکەیدا بسووتێن!

شوێنی دادگاییکردنەکەش، شاری قودسـە، کە ئەو شارەش لـە پـێش ئیسـلامێدا، داد و پێغەمبـەری جووەکـان (بـەنی ئیسـڕائیل) دروسـتی کـردووە و نـاوی نـاوە (ئۆرشـەلیم). ئـەو شـارەش زۆر جـاران لـە نێوانـێ ئایینە لە یەکدی جودایەکانەوە، داگیرکراوە و ئەستێندراوەتەوە، بەڵام کە عەرەبە ئیسـلامەکان، هـەرێمی فەلەسـتینیان گرتـووە، نـاوی ئـەو شـارەیان گۆڕیـووە بـۆ (قـودس)ی عـەرەبی، کـە هـەردوو مانایـەکانیش (ئۆرشـەلیم و قودس) بە زمانەکانی عیبری و عەرەبی، بە مانای (پیرۆز) دێن و بە زمانی کوردیش دەبنە (شاری پیرۆز).

لـەو شـارەدا، بـەردێکی پـانی ڕووبـەر گـەلێك فـراوان هـەبووە، کـە عەرەبە ئیسلامەکان دەڤەر و شارەکەیان داگیر کردووە، عەبدولمـەلیکی کـوڕی مـەروان، پێنجـەم خەلیفـەی ئەمەوییـەکان، لـە نێوانـێ فەرمانڕەواتییە دەسەڵاتی خۆیدا (٦٨٥– ٧٠٥ی زایینی) مزگـەوتێکی بـە گومبـەزی لەسـەر بەشێکی ئـەو بـەردە ڕووبـەر فراوانـەی، دروسـت کـردووە و بـە جـوانترین شـێوەی هونـەر و نووسـینەکانی عـەرەبی و ئیسـلامی ڕازاندویەتییـەوە، کـە بـەو مزگەوتـەش گـوتراوە (مزگـەوتی گومبەزداری سەر بەردەکە– مسجد قبة الصخرة)، دیارە بەردەکـەش، لەبـەر ڕووبـەری زۆر پـانی، بـە بـەردی خـوا (صـخرة الله) ناسـراوە،

کاتێکیش کە مزگەوتەکە تەواو کراوە، عومەری کوڕی خەتتاب لە مەککەوە چووە بۆ فەلەستین و لەوێش بۆ شاری قودس و یەکەم نوێژی لەو ڕۆژەیدا، لەو مزگەوتەیدا کردووە و چەند ڕۆژێکان لەو شارەیدا ماوەتەوە.

شاری قودس، هەر لە کۆنەوە هەتا ئێستێش، لەلایەن کەسانی مەسیحی و جوولەکە و ئیسلامییەوە، بە پیرۆز تەماشا کراوە، لەو ڕۆژەشەوە کە خودا بابە ئادەمی خستۆتە سەر زەوی، شاری قودس ڕووگەی هەموو پێغەمبەران بووە هەتا ساڵی ٦٣٠ی زایینی کە موحەممەدی پێغەمبەری ئیسلام (د.خ)، لە شاری مەدینەوە گەڕایەوە بۆ مەککە و داگیری کردەوە، ئەوجار ئەو دەمەی لە مەککە، کەعبە بوو بە ڕووگەی سەرجەمی ئیسلامەتییە، ئەم گۆڕانەش لەبەر چەند هۆیەك ڕووی دا، کە یەکێکیان ئەوە بووە حەزرەتی ئیبراهیم ئەم شوێنەی لە کۆندا ئاوەدان کردۆتەوە.

دانەری دەقی گەلۆیەکەمان، ئەگەر لە بابەتەکەیدا بەردی خوا (صخرة الله)یەی بەکارهێناوە، هەر لەبەر پیرۆزیی شوێنەکە و دەرچوون لە دوعای باوی زۆر کۆن و بەکار هێندراو بووە، هەم لەبەر ئەوەش کە لە نێو سوێند و دوعایاندا، شازیەتییە بەرچاوی پێوە دیار بێ و لە دوعایەکانی دیکەی پێشووتر، کە چەند بارەن، سەرنجڕاکێشتر بێ!

لە نێو کوردانیشدا، گوتێکی کۆن هەیە لەسەر ئەم بابەتەی، دەڵێ: "ئەوەڵ شام و ئاخیر شام" دیارە ئەم گوتەیەش مانای ئەوەیە، کە زووتر ڕووگە لە شامێ بووە، لە دواجاری زیندووبوونەوە و هەستانەوێشدا، تاوانبار و بێ تاوان، هەر لەوێ دادگایی دەکرێن و لە یەکدی جودا

دەکرێنـــەوە. بێگومـــان دیـــارە کـــە شـــاری قودســـێ، لـــە فەلەســـتینێیە و، فەلەستینیش بەشێکی گرنگی ولاتـی شامێیە و، هـەر وەکو گوتیشمان ئـەو شوێنە هەر لە دێرینەوە ڕووگە بووە، بۆ نموونە تایـەر بـەگی جاف لـە بەیتـە شیعرێکیدا ئاماژەی بۆ ڕووگەی کۆن و نوی کردووە، کە گوتویەتی:

یـەك نەفـەس چاکی نـەهێنا کەعبەتـەینی بەختەکـەم
شەشـــدەرم گـیراوە، دامـــاوم بـــە دەســـتی نـــەردەوە[1]

گەلۆ، ئەمن گەلێك نیگەران بووم کە دیتم ئەم شیعرە لـە دیوانەکـەی تایـــەر بەگـــدا بـــە خراپـــی دەســـتکاری کـــراوە و وشـــەی (کعبـــتین) کـــە وشەیەکی عەرەبییە، ماناکەی (دوو ڕووگان) دەگرێتەوە، هەستاوان بـە چاپکردنێ دیوانەکەی شاعیر، ئەم وشەیان زۆر بە ناشێیانە گۆڕیوە بۆ وشە و دەستەواژەی (طالع و هـەم بەختەکـەم)، بەم تێکدانەش، مانـای شیعرەکە بێ هێز بووە و بیری تیـژی شـاعیریش، کول و شێوێندراوە، کە شیعرە گۆڕدراوەکە بەمجۆرەیە:

یـەك نەفـەس چاکی نـەهێنا طـالع و هـەم بەختەکـەم
شەشـــدەرم گـیراوە، دامـــاوم بـــە دەســـتی نـــەردەوە[2]

لێرەدا بە چاکی دەزانم بە هـەموو ئەو کەسانە بڵێم، کە بە نـەزانی دەســـتکاری بەرهـــەمی کەســـان دەکـــەن، هەڵەیـــەکی گەورەیـــە، چـونکە

---

١- لە پەنجاکانی سەدەی بیست، ئەمن ئەو شیعرەم وەکو دروست لەبەر کردووە و ئەوەی ئەمن نووسیومەتەوە، ڕاستترە لەوەی نێو دیوانەکەی کە شێوێندراوە.

٢- دیـوانی تـاهیر بـەگی جـاف، چـاپی چـوارەم، لەسـەر ئـەرکی گیـوی موکریـانی، چ(کوردستان)، هەولێر، ١٩٦٩.

ئەگـەر کەسـەکە هـەر شـتێکی نووسـیبێ، بـۆ خـۆی لێـی بەرپرسـە، لێرەشـدا بـە تایبـەتی زانایـەکی وەکـو تـاهیر بـەگی جـاف، شـاعیری بـە ئـەزموون و شـارەزای وشـە و مێـژوو، تێکـەڵ لەگـەڵ هـەموو چـین و توێژەکانی کۆمەڵ!

گەلێ دۆستان و برادەران، ڕاستە ئەگەر پێشینان گوتویانـە " قسـە، قسەی دێنی" جا بۆ ئەوەی زۆر لە بابەتەکەمان دوور نەکەوینەوە، ئـەم فەرموودەیـەی خـودای مـەزن و گـەورە دەخەینـە پـێش چـاوان، کـە دەفەرموێ: "ولا تبخسوا الناس اشیائهم – سورة الاعراف ٨٥" واتـا: ماڵی خەڵکی بە ناهەق سووك مەکەن.

ئەمن وای بە باش دەزانم، هەر جارێکی نووسینی کەسێکی زانامـان کەوتـە بەرچـاوی سـەرنجانان و تێـی نەگەیشـتین، هـەر وەکـو خـۆی بیهێڵینــەوە و دەســتکاریی نەکــەین، هــەتا لــە بەدواداچــووناندا، ڕاسـتییەکەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە، ئـەوەش لەبـەر ئـەوەی ئـەم جـۆرە وشانە و دەستەواژە دەربڕینانە، کاری مرۆڤـی شـارەزا و بـە ئـەزموونن و لەم کارەشیاندا ئەوان کەمتر بەلای هەڵاندا چوون!!

لـە شـێوەی ئـەم شـیعرەی تایـەر بـەگی جـافیش، کـە باسـی دوو ڕووگــەیی دەکــا، شــیعری دیکــە دەبینــدرێن، هــەر وەکــو مـیرزا عەبـدولڕەحیمی سـابڵاخی (وەفـایی) لـە تاکـە شـیعرێکی نێـو شـیعری بەناوبانگی (لەبەر نازی چاوبازان)دا دەڵێ:

لەسەر تاقی دوو ئەبرۆی، مەیلی زوڵفان دەمکێشێ
خـۆ وەختـە مـن کـافر بم، چـبکەم قیبلـەم گـۆڕاوە[1]

---

١- دیوانی وەفایی، سەرچاوەی پێشوو.

لە کۆتایی قساندا، ئەمنیش ئەم تاکە شیعرەی مەحوی دەڵێم:

ڕەببی مووی لێ بێ زمانی، پەنجەکانی هەڵوەرێ

هەر کەسێ گوڵشەن بە دەردی (کوڵخەن[1])ی دۆزەخ بەرێ[2]

## گوڵەکەی باخی شەددادی:

گەلۆ، گەلێك جاران لە نێو قسە و باساندا باسی گوڵەکەی باخی شەددادی دێتە گۆڕێ و دەگوترێ و دەبیسترێ و تێکڕای گوتەران و بیستەرانیش، بیر و بۆچوونیان بۆ باخی کەسێکی عەرەبی دەسەڵاتدار و دەوڵەمەند دەچێ، کە لە شوێنێکی عەرەبستانێدا ئەو باخەی پێکهێنابێ. یان بۆچوونەکانیان بۆ باخێکی دیکەی هەمان شێوە ڕۆیشتوون، کە ئەویش باخی (ئیرەم)ێ بووە، هەر وەکو لە نێو

---

١- کوڵخەن: توون، وەکو توونی گەرماو. وشەکە بەم جۆرەیە (کوڵ + خان) جێگای ئاگرکردنەوە. بۆ سووکهاتن لەسەر زمان، بزوێنی درێژی وشەی (خان) کورت کراوەتەوە. بەڵام وشەی (گوڵشەن) بە باخچەی گوڵان دێ. بە گوێرەی ئایینیش، گوڵشەن باخی بەهەشتە و وشەی (کوڵخەن)یش، شوێنی خۆشکردنی ئاورە لە دۆزەخ. لە نێوانی ئەم دوو وشەیەشدا، لە ڕووی ڕەوانبێژییەوە، وشەکان دژی یەکدین. دیارە فریشتە لێپرسراوەکانی ئەو دوو شوێنە، لە ڕۆژی هەستانەوەدا، کارەکانیان دژە کارە، ڕەزوانییە، باخەوانی باخی بەهەشتە و، زەبانییەش ئاگرخۆشکەری ئاگری دۆزەخە. جاران ئافرەتی کورد بۆ کاروباری شووشتنێ لەسەر ئاوێکی، ئاوریان دەکردەوە، تامان، یان کەڵکە بەردە دیوارێکی بازنەییان لە دەورەی شوێنەکەی دەکرد و کاری خۆیان تێدا فەراهەم دەکرد. وەکو هاوکێشەش، (ئاگر + ئاو = کوڵکردن + بەردی دیواری بازنەیی کوڵ و حەسار) بە تونی گەرمکردنی گەرماویش دەگوترێ کوڵخەن.

٢- دیوانی حەمدی، سەرچاوەی پێشوو.

قورئانێدا و لە سوورەتی (والفجر)یدا لە ئایەتی "ارم ذات العماد"یدا باس کراوە، جا لەبەر ئەوەی ئەو ئیرەمە کۆشکێکی گەورەی بە کوڵەکە بووە، بە ئاشکرایی دیارە باخ نەبووە، بەڵام زۆر وێدەچی، کە ئەو کۆشکە باخێکی زێدە گەورە و ناوداری هەبووبێ، هەر وەکو مستەفا بەگی کوردی لە شیعرێکی دێڕێک کوردی و دێڕێک عەرەبیدا بە قەشەنگی باسی دەکا، وەکو ئێستێ دەیبینین، دیارە دێڕە کوردیەکەشی بەشێك کوردی و بەشێك عەرەبین:

حۆری ڕەوزەی جەنانی، یا گوڵی باخی ئیرەم
ام نجوم العرش، ام شمس علی فوق العلم

لێرەدا دەسەلمێندری، ئەگەر گوڵەکەی باخی شەددادی هیچ پەیوەندییەکی بە گوڵەکەی باخی ئیرەمییەوە نییە و زۆریش لە یەکدی جودان، ئەگەرچی هەردووکیشیان گەورەباخ و جوانەگوڵزار و گوڵن، بەڵام هەر یەکەیان لە باخێکی و لە دەڤەرێکی زۆر لە یەکدی دووردان.

گوڵەکەی باخی شەددادی کوردستانی و کوێستانییە، هەر چوار وەرزی ساڵێش هەر وەکو نەوبەری گەش و ڕازاوەیە، بێجگە لەو گوڵەی باخی ئەو شەددادە کوردەش، لە دەڤەری شکاکایەتییە و ناوچەی برادۆستێ ڕەنگین و گوندی چاریەی کارەسات دیتە، هیچ گوڵێکی جوانی دیکە نییە[1]، دیارە بە گوێرەی یەك دەڤەریەش، لە باسی نێوەرۆکی ناوی شوێنەکاندا، ئەم ڕاستییە دەردەکەوێ و دەڤەری (سۆما)یەش بەڵگەیە، شەددادییەکان ئەو زنجیرە پاشا

---

١- کورد و کوردستان، کەمال بورکای، چاپی یەکەم، چ(منارە)، هەولێر، ٢٠٠٨، ل١٤٨- ١٥٢.

کوردانە بوون، کە لە سەرووی خۆراوای ئێرانێدا لە نێوان ساڵانی ٩٥- ١٠٧٥ی زایینی و بۆ ماوەی ٩٨٠ ساڵان، پاشایەتییە ناوچەی ئازەربایجان و دەوروبەرەکەیان کردووە و یەکەم دامەزرێنەری ئەو دەوڵەتەش (موحەممەدی کوڕی شەدداد)ی بووە.

ئەم شەددادیانەش هەتا کۆتایی دەسەڵاتیان، چواردە پاشایان، یەك لە دوای یەکدی، دەوڵەتەکەیان وەکو پێویست بەڕێوە بردووە و لە یەکەمجاریشدا پایتەختەکەیان شاری (دوین) بووە و دواتر گوێزراوەتەوە بۆ شاری (گەنجە)ی. ئەم حکومەتەش، یەکەم حکومەتی کوردی بووە و خاکەکەی لە ئازەربایجانێ و (ئەران)ێدا هەڵکەوتووە و هەتا سەدەی دوازدەهەمیش، ماوەتەوە و بە ڕەچەڵەکیش لە بنەماڵەی هۆزی (ڕاوادی) بوون. سەلاحەددینی کوردی موسڵمانیش، کە دەوڵەتی دامەزراندووە، هەر لەو ڕەچەڵەك و بنەماڵەی بووە.

شەددادیەکان زۆر لەمێژەوە لەسەر خاکی نێوانێ ئازەربایجان و ئەرانێدا ژیاون، لە سەردەمی داگیرکارییە عەرەبە ئیسلامەکانیشدا، لە دوای شەڕێکی زۆر سەخت، بە هۆی ڕێککەوتنێوە لەسەر خاك و جێگەی خۆیان ماونەتەوە، بە مەرجێك پاراستنێ کەلتوور و ڕێ و ڕەسم و بەڕێوەبەرایەتییە خۆیان لە دەڤەرەکەیاندا بکەن.

لەم دەڤەرەشدا، ناوی هۆزی کوردی (باڵاشیان) وەدەردەکەوێ، کە ئەم هۆزەش پارچێکی ڕەگەزی (ڕاوادی)یەکان بووە و لە ناوچەکانی (دێرسم، بنگۆل، چاڵدێران، ئەرزڕۆم)ێدا، دەناسرێن و ئێستێش لەو دەڤەرەدا، ناوی زۆر لەم شێوەیە دەبیسترێن، وەکو ناوەکانی (شەدداد، شەدید، شادیان و شادی.

سەلجوقیەکان، لە ساڵی ١٠٥٤ی زایینیدا، بە بەڕێوەبەرایەتییە (تۆغرڵ بەگ) ئەو ناوچەیان داگیر کردووە و دەوڵەتەکەیان ڕوخاندووە و کۆتاییان بە دەسەڵاتی شەددادیەکان هێناوە، لە دواتریشدا شەددادیەکان هەستاونەوە و کەوتونەوە[1].

بۆ ساغکردنەوێ گوڵەکەی نێو باخی شەددادی، مەقامی گەلۆیەکەشمان، بە باشم زانی ئەو ڕوونکردنەوەیەی سەرەوە، وەکو کورتە باسێك بخەمە بەرچاوی خوێنەرانی خۆشەویست، ئەمەش لەبەر ئەوەی هەتا دراوسێیەکانمان ناوی ئەو گوڵ و گەلۆیەیان نەدیتوە و نەبیستوە، دەنا دەڵێن: ئەم گوڵە، گوڵەکەی باخی نەنکێم بووە و، ئاوازی مەقامەکەشی، باپیرمان دایناوە و بە جاحێڵیش حەزی لە نەنکێم کردووە و ئەو ئاوازەی بۆ چڕیوە! جا، با هەتا کەمەکاتێك ماوە، نەکو ئەوانەشمان لێ بکەنە خاڵانێ داستانەکانی: گەلگلمێشێ و سەلاحەدینی ئەییوبی و... وەکو سامانی نەتەوەیی خۆمان، ڕزگارکردنیان کارێکی پێویستە. بەم بۆنەشەوە، گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتەی خوارێ، زۆر لە جێی خۆیدایە:

دەگێڕنەوە لە سالآنی جەنگی یەکەمی جیهانێدا، دەوڵەتی عوسمانی لەبەر کەمییە ئابووریانی، جەندرمەکانی بە خەڵکی بەخێوکردوون، جەندرمەکانیش لە کوردستانێدا چووبانایە هەر ماڵێکی و هەر چییەکی بیانویستبایە و بکردبایە، بۆ خۆیان خاوەن ماڵ بوون و کەس دەسەڵاتی بەسەریاندا نەبووە. لە شاری کۆیە،

---

١- کوردو کوردستان، سەرچاوەی پێشوو.

بێوەژنێـك لەگـەڵ كـوڕە مێردمنداڵەكەیـدا پێكـەوە دەژیـان، هـەموو ژیانیشیان تەنیا لەسەر مریشكێكی هێلكەكەر بووە.

ڕۆژێكـی، كوڕەكـە بـە داكەكـەی گوتـووە: دایـە، بـا مریشـكەكەی بكوژینەوە و بیخۆین، داكیشی پێی گوتووە: ڕۆڵە ئەگەر مریشكەكەی بكوژینـەوە، هێلكـەمان نامێنـێ بیخـۆین، ئەگـەر هێلكـەشمان نـەما بیخـۆین، ئـەوە لـە برسـان دەمـرین! كوڕەكـەش گوتویـەتی: دایـە بـا بیخـۆین هـەتا ئەنـەدۆڵی[1] نـەهاتوون و لێیـان نـەخواردووین. بـەڵام داكەكەی بە قسێی نەكردووە و دڵی بڕوای نەداوە مریشكەكەی سەر بـبڕێ. بـۆ ڕۆژی دوایـە جەندرمـەی توركـان هاتوونـە گەڕەكەكـەیان و لەوێ مریشكەكەیان دیتوە و گرتوویانـە و دەستوبرد كوشتویانەتەوە و هەر بە ژنەكەشیان كوڵاندووە و خواردوویانـە و ڕۆیشتوون. ئـەمجار كوڕەكـە بـە داكەكـەی گوتـوە: دایـە بـە قسـێ منـت نـەكرد، هـەتا مریشكەكە و هێلكەكەشمان لە دەست چوون!

گـەلی دۆسـتان و بـرادەران و دەسـتەی خوێنـدەوار و دڵسـۆزان، بـا ئەوەنـدەی بۆمـان دەكرێ، ئـەوەی لێیـان دزیـوین هـەوڵی ئەسـتاندنەوێیان بـدەین، لـە ئێسـتێش بـە دواوە ماڵـێ خۆمـان بپـارێزین و گەشـەی پـێ بدەین... هەر وەكو پێشینان گوتویانـە: "ماڵێ خۆت توند بگرە و كـەس بە دز مەگرە!" هەر لەم ڕووەشەوەیە كە حاجی قادری كۆیی گۆتیتی:

---

١– ئەنەدۆڵی: جەندرمەی توركان.

حـاجی کەسێکە بێکـەس، بـۆ ئێـوە قـوڕ دەپێـوێ
گوێی لـێ دەگرن زەریفە، نایگرن خـەتا لە خۆتـان[1]

جا گـەلۆ، ئەگـەر بە قسێی نەکـەین، ئەوەنـدەی ماویشـمانە، وەکـو ئـەوانی دیکـەی لـە دەستچـوو، لـە دەسـت دەچـن و لـە دوایەشـدا پەشمانی، کەم و زۆر، هیچ بەرهەمێکی نابێ!

ئـەمن، هـەر ئـەو بۆچوونەش بـوو ئەگـەر هانیـدام بەشێکی نزیکـی کۆتایی تەمەنێم لە پێناوی کۆکردنـەوە و بە کتێـب کردنـێ، بە بابەتـە پـرش و بڵاوەکانمـدا بـەخت بکـەم. دیـارە دوژمنـانی کـورد، چـۆن پـەلاماری کوردسـتانێ دەدەن و دەیانـەوێ کـوردان بـێ وڵات بکـەن و هەروەهاش کەلەپوور و هونەرەکەیان.

هەر لێرەدا بەجێی خۆی دەزانم، ئەگەر لەسەر ئەم شیعرەی مسـتەفا بـەگی کـوردی، ڕوونکردنـەوێکی بخەمـە پـێش چاوان، کـە شـاعیر بـەم سەرەتایەوە دەڵێ:

حـۆری ڕەوزەی جـەنانی، یـا گـوڵی بـاخی ئـیرەم
ام نجــوم العــرش، ام شمــس علــی فـوق العلـم

ئەمن لە ساڵەکانی پەنجاکانی سەدەی بیست، ئەم شیعرەم بە شیعری مستەفا بەگی کوردی لەبەر کردووە، بەڵان لـە چاپی نوێی دیوانی نوێی شاعیردا لـە سـاڵی ٢٠١٠، زۆری بـۆ گـەڕام کەچی وەبـەر چاوانم نـەهات و پێم وایە چاپکردنی لەبیر چووە و هەبوونی بە نەبوو بووە!

---

١- دیوانی حاجی قادری کۆیی، لێکۆڵینەوە و لێکدانەوەی سەردار حەمید میران و کەریم مستەفا شارەزا، ١٩٨٦.

شیعرەکە بریتییە لە چەند بەیتێکی کوردی و عەرەبی، بە دوابەیتی شیعرەکەشدا دیارە، کە شیعری مستەفا بەگی کوردییە، چونکە شاعیر لە دوابەیتی شیعرەکەدا دەڵێ:

چونکە نامەی دەردی (کوردی) قەت نەهاتە انتها

تمت القرطاس جف الحبر وانشق القلم[1]

## نێوقەد بە دراو:

لە لێکۆڵینەوێ نێوقەد بە دراوێدا، چەند وشێکی ڕەسەنی کوردی، لەسەر گۆڕاییە لێدوانەکەماندا دیار خۆیان دەنوێنن، ئەم وشانەش وەکو وشەی فۆلکلۆری کوردی، بە پێویستی دەزانم ئەگەر کەمێکیان تۆز لێ بتەکێنم و هێندێکیان ڕووناکایی بخەمە سەرێ، بۆ ئەوەی پتر و جوانتر و، وەکو دروستی خۆیان وەدەربکەون و جوانی و دڵگیریەکەیان بدرەوشێنەوە و لە نێو پەڵە نێرگزجاڕێ وشاندا، وەکو ئەستێرەی گەلاوێژێ، گوڵزاری شەوی ئاسمانێ ڕازاوەتر بکەن.

هەر وەکو دەزاندرێ، وشەکانی (نێو، ناو) لە زمانی کوردیدا لە یەکدی جودا نەکراونەوە، وەکو ئەگەر بپرسین "ئەو کوڕە ناوی چییە؟" یان "ئەو کوڕە نێوی چییە؟" لە سلێمانی و دەوروبەرەکەیدا وشەی (ناو) بۆ مەبەستی باسکراو دەگوترێ، بەڵام لە دەڤەرەکانی مەرگە و پشدەر و بیتوێن و موکریاندا، وشەی (نێو) لە لایەن کەسانی بە تەمەنەوە، بۆ هەردوو مەبەستی کەس و شوێن، وەکو یەکدی بەکار

---

١. دیوانی مستەفا بەگی کوردی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ل ٣٨، ١٩٧٣

دەهێندرێن، بۆ نموونە: (ئەو کچە ناوی گەلاوێژە) یان وەکو شێخ فەرخی مامان ئەگەر دوورا و دوور لە نێو باخی، خاتوونێ ئامۆزا و خۆشەویستی خۆی دەبینێ، هەر بە سواری جوانولەکەیەوە، بانگی ڕادێلێ و بە دەنگ و ئاواز پێی دەڵێ:

ئەرێ هۆ گوڵچنێ لە نێو باخی ماڵێ میرانی گوڵان دەچنی،

ئەمن هەر چەندە زەینێ خۆم دێنم و دەبەم، ئەتۆ یارێ منی[1]

دەربارەی وشەی (قەد)یش، لێرەدا بە کوردییەکی بێ گرێ و گۆڵ و دوور لە قەدی (درەخت و...) وشەی قەد لەم باسەماندا بۆ مرۆڤان بە باڵا دەگوترێت، کە پێشی دەگوترێت بەژن. وشەی نێویش، بە نێوانێ هەردوو بەشی بڵندایی جەستەی مرۆڤان دێت، هەر وەکو حەسەن زیرەکی بۆکانی و هونەرمەندی گۆرانیبێژی کورد لە گۆرانییەکیدا دەچڕێ:

زوڵف شۆڕ و کەزی شۆڕ و بەژن شۆڕ

سەرەوشۆڕم دەکەن هەرسێك بەرەو گۆڕ[2]

بەڵام دیارە ئێستی وەکو سەردەم، بە وشەی (بەژن)ی ڕەسەنی کوردی دەگوترێت (باڵا)، کە ئەمن پێم وایە وشێکی فارسییە و نیشانەی لامی قەڵەوی بۆ زیاد کراوە. جا، وەکو گوتراوە: "قسە هەزارە و دوانی بە کارە!" با، ئەمەش پتر وەنێو زۆر گوتنێ نەکەوین و بڵێین: پێکهاتەی وشەی نێو قەد لە دوو وشەی دروستی (نێو + قەد)دا، خۆی دیوەتەوە، کە لە جەستەی مرۆڤاندا لە سەرووی بە یەکدی گەیشتنێ هەردووك لاقانەوە دەست پێدەکات، هەتا دەگاتە

---

١- داستانی شێخ فەرخ و خاتوو ئەستی، کاسێت، دەنگی سەلیمی بایزی پشدەرێ.

٢- گۆرانییەکی حەسەن زیرەك.

سەرەتای سینگی، کە لە شێوەی ژمارەی هەشت دایە، بەڵام لە باسەکەی مەدا، بە تێکڕایی، وشەی نێوقەد دەربڕینێکی خواستراوە لە بری پشتێنێ لە پشتبەستنێ تاقە پێوەدراو بەکار هاتووە. وشەی (تاقە)ش تاکەشی پێدەگوترێ. ئەوەش بە هەردوو نێوەکەیەوە پارەی سەردەمی خۆی بووە، کە بەبەر یەقەی کوڵەجەی ئافرەتانەوە دراوە و پشتێنی لەپشت بەستنێی پێ ڕازێندراوەتەوە، کە لە ئێستێدا پێی دەگوترێ (پشتێنێ بە لیرە).

دەربارەی ئەو پارە کانزایانەش، کە لەو سەردەمەیدا بۆ ئەو مەبەستەی بەکار هاتوون، هەر وەکو ئەمن دیتومن، کە بە یەخە و پشتێنێ ژنانەوە کراون، پارەی کانزایی تومەنی ئێرانی، فەیسەڵی و غازی ئێراقی[1] و ڕیاڵی سعودی، لە سەرووی هەر ڕیزێکی یەقەی کوڵەجەیدا، تەنیا ڕیاڵێك دادەدروا. لە بارەی نرخی ئەو پارانەش، یەك تومەن بەرابەر یەك فەیسەڵی یا یەك غازی بوو، نرخی هەر یەکێکیش لەو دوو پارانە، ٥٠ پەنجا فلوسی ئێراقی بوو، ڕیاڵیش بەرابەری چوار پەنجا فلوسی بوو، کە دەیکردە ٢٠٠ فلوس. ئەم دراوانە، لەلای سەرپەڕێکیانەوە کونێکی بچووکیان تێدەکرا و بە ڕیز بە دوای یەکدیدا بە دەرزی و دەزوو، بە شوێنی مەبەستدا دادەدروان و لە کاتی هاتوچۆیاندا ئاوازێکی خۆشیان لێ دەردەچوو.

گۆران لە شیعری (جوانی لادێ)دا، جوانی وێنا کردووە، کە لە ناخەوە گوتویەتی:

---

١- ئێراق: عێراق.

چەن جوانی بەرەو مەغریب ئەچی زەردە ئەدا لێت
پرشنگی خشڵ ئەبڵەق ئەکا دەوروبەری ڕێت
ڕۆژی دەمی کەل حازرە بۆ پێشکەشی بەر پێت
ئێوارەیە وا هەڵگرە سا گۆزەیی تازە[1]!

ئەگەر بەراوردێکی نێوقەدی جەستەی مرۆڤیٚ، لەگەڵ هەردوو بەشەکەی دیکەی خواریٚ و سەرێیدا بکەین، بۆمان دەردەکەویٚ کە لە بەشی خواریٚ و لە لای پشتەوە، کەمە ئەستوورایییەکی بەرزی ڕاگری بەشی سەریٚ هەیە و پێی دەگووتریٚ (سمت)، ئەم بەرزییەش قەشەنگییەکی داوەتە باریٚ پشتەوەی سەرجەمی جەستەکەی، کە لە مرۆڤی مێینەدا پتر دیار دەنوێنی. لە باریٚ پێشەوەش بۆ سەرەوەی نێو قەدیٚ، پێی دەگوتریٚ سینە، وەکو لە ڕەگەزی ئافرەتاندا شوێنێکی بەرزی سینە کۆتریە و بە جووتێك سەرچاوەی کانیی ژینی ڕازاوە و ڕوو بەرەو ئاسمان بۆ خودای ئافەریدەی خۆیان، سوپاسگوزارییە دەکەن!

لە کوردەوارییەدا، لە هێندێك دەڤەراندا بە نێوقەدیٚ دەگوتریٚ (کەمەر)، کە ئەم کەمەرەش، لە جەستەی ئافرەتاندا زۆری سەرنجیٚ پەخشاننووسان و شاعیران ڕاکێشاوە، کە لە بۆچوونی کلاسیکە بیرمەندەکاندا نێوقەدی باریکیان، بە جوانترین نێوقەد داناوە و بە یاسای زێدەڕۆییەش نێوقەدیٚ زەرگەتە و مێروولەشیان، هێشتا پتر پیٚ ئەستوورتر بووە لە نێوقەدیٚ خۆشەویستەکەیان، جا بۆ نموونە و

---

١- دیوانی گۆران، ئامادەکرنی محەممەدی مەلا کەریم، چ(کۆڕ)، بەغدا، ١٩٨٠،

بەڵگـە لـە نێـو ئـەو بیرمەنـد و شـاعیرانەدا دوو بەیتـە شـیعری حـاجی قادری کۆیی دێنینە گۆڕێ کە گۆتیتی:

لە نەزاکەت کەمەری وەك خەتی ئەهلی حیکمە[1]
لـە نەبوونـدا دەهـەنی بـێ قسـە عـەینی عەدەمـە

حاجی لە دێڕی یەکەمدا، جوانی و باریکی و ڕێك و پێکی نێوقەدی خۆشەویسـتەکەی، وەك خـەتی بـاریکی پێنووسـی کەسـێکی خۆشنووسـی دانـا و وانـا[2] دانـاوە، لـە دێـڕی دووەمیشـدا زارەکـەی لـە بچـووکیان نابینـدرێ، هـەر وەکـو ئـەوەی ئەگـەر دەمـی بـۆ نـەکرابێ، شـوێنەکەی بـێ شـوێنەوارە و نابینـدرێ، لـە کـاتی قسـە نـەکردن و بێدەنگیشـدا، هـەر وەکـو دەمـی نـەبێ وایـە! هـەر لـەم ڕووەوە لـە شوێنێکی دیکەدا حاجی گۆتیتی:

لە تەسویری قەڵەم مووی کەوتە بەردەم نوختەکی دانا
ئـەوی کـردە کەمـەر نـەقاش ئـەمی بـۆ دەمـی دانـا[3]

لەم بەیتە شیعرەدا وا دەردەکەوێ ئەگەر نەقاش بۆ ئەوەی وێنـەی بـەژنی خۆشەویسـتەکەی لەسـەر ڕووبـەری کاغـەزێك بکێشـی، نـوکی پێنووسـەکەی دەخاتـە سـەر کاغـەز و خـەتێك دەکێشـی، بـەڵام لـەو کاتەیـدا لـە ناکـاو موویـەك بـۆ وەسـتاندنی نووسـینەکەی بـە درێـژی کەوتۆتە پێش ڕێڕەوی نووسینەکەی، وەکو ئەوەی بە وێنەکێشەکەی

---

١- دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەرچاوەی پێشوو.

٢- وانا: مامۆستا، خاوەن زانیاری، دەرسدەر، وانەبێژ. (ئنستیتیوت)

٣- دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەرچاوەی پێشوو.

بڵـێ: نەکـەی! تـۆ نـاتوانی هێڵێکـی لـە مـن بـاریکتر بکێشـی بـۆ قـەدی خۆشەویستەکەت، دیارە هەر ئەمن لە باریکییەدا زۆر گونجاوتری ئەم کارەم، جا نووسەرەکەش باوەڕی بەم کارەی کرد و لـە جێگـەی خـۆی نوکی پێنووسەکەی بڵند کردووە و، لە کۆتایی خەتەکەشی خاڵێکی زێدە بچووکی نیشانەی ڕاوەستانی داناوە. وێنەکێشەکەش خاڵ و خەتەکەی وەکو نووسینی خەتێك و خاڵێك (ــ .) لە چەشنی باڵایەکی ڕاکشاو واز لێ هێناوە و، خەتەکەی بەرابەری کەمەر و، خاڵەکەشی بە دەمی تەنگ چواندووە، کە لە بێدەنگییەدا هەر وەکو نەبووە!

دیارە لە لێکچواندنەکانیشدا، وێنەی دروست بەدی دەکرێ، وەکو زاری بچووك و قەدی بڵند و نێوقەدی باریك، هەمووشیان سەرنجڕاکێشن، بەڵام لـە هـەموو لێکچـواندنەکاندا، زێدەڕۆییـەکی بـاوی کلاسـیکییانەی ئـەو سـەردەمەی بـەدی دەکـرێ، کـە لـە نێـو سـەرجەمی تێکـڕای شـاعیران لـەو بارەیـەوە بـرەودار و بـاو بـووە. بێگومـان زێـدەڕۆی و کـەمڕۆییش لـە هـەر بابەتێکیدا بێت، لە دروستی و بابەتییە دوورمان دەخاتـەوە، وێنـەی دەقا و دەقی خۆیمان نیشان نادا، بەڵام بۆ ڕوونکردنەوێ و نەمانی گومانان هەر وەکو زێدەڕۆیی و کەمڕۆییش پێویست و گرنگن.

بێگومان هەموومان دەزانین، کە نێوقەد زۆر باریك بوو، بۆ باوەش تێوەرێنـان و گەوزگـەوزانێ کـەمێك نـەگونجاوە، هـەر وەکـو قـەدی ئەستووری قەبەش، کە باوەشـی لـێ ناگاتـەوە و لـە گەوزگەوزانێـدا، هەڵسووڕاندنی کارێکی دڵ پڕ ئاسوودەیی نییە!

جا لەبەر ئەم باریکی و ئەستوورییەی بەژنان و نێوقەدان، وا جوانـە کـە ئـەم شـیعرەی کامـەران مـوکری بخەینـە بـەر دیتـەی خوێنـەرانی بابەتەکەمان کە دەڵێ:

بەژنی تۆ یا بەژنی ڤینۆس، ئەی فریشتەم شەنگترە
خونچە تەنگتر، یا دەمی تۆ یا دڵی من تەنگترە؟
چاوی کاڵی پڕ لە ورشەت، یا گەلاوێژ گەشترە
خاڵی گۆنای ناسکت، یا بەختەکەی من ڕەشترە؟
دەنگی دڵبزوێنی تۆ، یا شیعری من پڕ سۆزترە
پەرچەمی ڕێحانەییت، یا ڕۆژگار ئاڵۆزترە؟
ئەشقی من، یا گیانی ساوا، یا فریشتە پاکترە
ژینی جیایی یا مەرگ، کامیان لە کامیان چاکترە[1]؟

یان کەسێکی دیکە دەڵێ:

ئەی بەژن ڕێك، لەنجە جوان، خاوەن سەرنج شێوەت پەری
بۆ نیگایەك وێڵ و شەیدام، باڵی شیعرم هەڵوەری[2]

---

١- دیوانی کامەران موکری، پێشەکی نووسین و پەراوێز لێدان عەبدوڵڵا عەزیز خالد، لە بڵاوکراوەکانی گۆڤاری کاروان، ئەمینداریێتی ڕۆشنبیری و لاوان، چاپی یەکەم، ١٩٨٨.
٢- گۆرانییەکی نەجمەدینی غوڵامییە.

## خاڵی ڕەشی عاقرەوی:

زۆرم بیر و بۆچوون هێنان و بردن بۆ ئەوەی لە بارەی خاڵانەوە شتێکی نوێ ببینمەوە، ئەگەر پەی پێ نەبردرابێ و نەگوترابێ و نەنووسرابێ، بەڵام ڕووم لە هەر لایەکی دەکرد و پارێزم دەبردێ و بۆی دەچووم، هەر دەهاتمەوە سەر ڕێیە لەسەر ڕۆیشتنی ڕێبازی ئاشقە خاڵێکی لە پێشووتری دیکە، جا لەبەر ئەوەی ئەمن خاڵێکی قەشەنگترم نەدیتەوە، لە ناچاری و بێدەسەڵاتیان، کەوتمە زێڕاوکردن و ئارایشکردنێ، هەر خاڵێکی ئەگەر لە پێشتر گوترابێ و نووسرابێ و ئاشقە خاڵانی وەك شاعیران و نووسەران و بیرمەندان، ڕووگەییانە بەرابەری ڕاوەستا بن و سەریان بۆ شۆڕ کردبێ و دەستیان بۆ لەسەر سینەی دانابێ و حەسرەتمەندانەش دوور و نزیك پڕ بە چاوانیان لێیان ڕوانیبێ و هەناسەی خۆزگەی قوڵی پێکەیشتنیان بۆ هەڵکێشابێ!!

خاڵ، پنۆکە ڕەنگێکی جیاوازە لەسەر پانتییەکی ڕووبەر فراوانی تەختی یەکڕەنگی سادەدا، جا بە هۆی ڕەنگە جوداییەکەیەوە جوانییەکی جوانی سەرنجڕاکێشی دیار بە پانتا تەختە گەورەکەی دەبەخشێ و، ڕازاوە و نازدارتر و ڕەنگگینتری دەخاتە بەر دیتەی سەرنجی سەرنجدەران، لەم ڕووەشەوە عومەری خەییام جوانی فەرمووە:

ئەو دەشتە کەوا هەر لالەزارە
گوڵاڵەی خوێنی چەند شەهریارە

وەنەوشەی ڕەنگ شین لە خاک دێتە دەر
دەنکە خاڵەکەی سەر گۆنای یارە[1]

گەلۆ، دیارە ئەگەر ئێستێ لەم چوارینەیەدا وەرز بەهارە و بەرگی زەوینێ تێکڕا کەسکە، بەڵام بە هۆی گوڵ و گوڵاڵەی هەمەڕەنگەوە، لەسەر ڕووتەختی زەوییە خاڵدارانەوە وەدەردەکەوێ، لە نێو ئەو هەموو خاڵانەشدا وەنەوشە سەری خۆی وەدەرناوە و بەرابەری خاڵی سەر گۆنای نازدارێکی، کڕنۆشی بردووە.

پێم باشە بۆ دیتنی ئەم وێنە دروستەی کاری کردگاری مەزن، بنۆڕنە ئەم شیعرە زێدە ڕەنگینە نایابەی مەلا نالی، کە بۆ ڕوخساری جوانێکی دەڵێ:

عاشقی سونعی هەقم، قوربانی ڕەنگی قودرەتم
چاوی ماوی، خاڵی شین، کوڵمی سپی، زوڵفی سیا

ئاشکرایە، ئەگەر ئەم گوڵگوڵی و خاڵخاڵییەی سەر ڕوخسارێك، توانا و کاری کردگاری مەزنمان نیشان دەدا، لێرەشدا مەلا نالی توانای خۆی تێدا بەکار هێناوە و بەم جۆرە ڕێکی خستۆتەوە و دایڕشتووە و بە ئێمەی نیشان داوە و گیرۆدەی لێکدانەوە و بۆچوونی جودا جودای کردووین و هاویشتوینە نێو دەقەری دڵگیری جوانی خاڵستانییەوە!

---

١- عومەر خەییام بەکوردی، گۆڕینی بۆ کوردی شێخ سەلام سەید ئەحمەد، چاپی یەکەم، چ(مەعاریف)، بەغدا، ١٩٥١.

لە نێوانێ گوتنەکانی گەلۆیدا، لە هێندێك دەقاندا باس لە (خاڵی ڕەشی عاقرەوی) دەکرێ و دەگوترێ. ئەمن وەکو خۆم، زۆرم بیر لەو جۆرە خاڵانە دەکردەوە، بەڵام سەری خۆمم لێ سەرودەر نەکرد، هەتا ڕۆژێکی لە کاتی ئەو لێکدانەوەمدا، لە ناکاوێکی ژنێکی مەهابادیم هاتەوە نێو یادان، کە لە قەڵادزێ دەژیا و زۆر جاران وەکو کەسێکی گەورە و خۆشەویست سەردانی دەکردین و لە کنمان دەمایەوە. ئەو ژنەش ناوی (حاجی خاتوون) بوو.

شەوێکی زستانێ لە ماڵێ خۆمان، لەگەڵ چەند سەرەژنێکان، باسیان لە مووروو و زەنگیانە و ملوانکان دەکردن، کە سەردەمانێکی ئافرەتان بە مل و بەرۆکێ خۆیانەوە دەکردن، ملوانکێکیش لەو ملوانکانە، مووروەکەی بەردێکی بچووکی شێوە دووپشکی بووە و خاڵی وردی ڕەشی تێدا بووە، بەم بەردە ڕەشە لە زیوگێڕاوەشیان گوتووە ئاقرە، یان ئاقرەوی و، ئەم ملوانکەش پتر بە یەخەی منداڵی چوکەڵەی خۆشەویستی کچانەوە کراون، ئەم بەردانەش شێوەی جودای وەکو سێگۆشەیی و بازنەییان هەبووە، بە گوێرەی دەسەڵاتی هەبوونێش، لە کن وەستایان، دەورەکانیان لە زێڕ و زیوان دەگیران و زۆریش بە پیرۆز زاندراون.

وشەی عاقرەوی، بە بۆچوونی من وشێکی عەرەبییە و زۆر مانای لە یەکدی دووری هەیە و، بەتەنێش لە مانایەکیاندا، وشەکە وەکو گونجاو لەگەڵ ئێرەدا (عقرب)ە، کە مانای دووپشك دەگەیەنێت، زۆر وێچووە ئەگەر لە زمانی کوردیدا، وشەکە گۆڕانی بەسەردا هاتبێ و بووبێت بە (عاقرەب) و عاقرەبیش بووبێت بە عاقرەو.

لە ڕەنگە ڕەشەکەشیدا، لەگەڵ ڕەنگی دووپشك یەکدی دەگرنەوە و لەگەڵ ڕەشیی خاڵانیش دەبنە (دووپشکی ڕەش و بەردی ڕەش و خاڵی ڕەش)، وەکو لە یەکدی چوون، لە نیزیکییە گونجاویەشدا، وێدەچێ بۆچوونێکی زۆر دروست بێ. لە لایەکی دیکەشەوە بسکی ئافرەتان، کە بە لاجانگاندا[1] بە هەردوو لا ڕوومەتاندا شۆڕ دەبنەوە و سەرەکان بەرەو خوار درێژ دەبنەوە و، کەمێك هەڵدەگەڕێنەوە و ڕوو لە سەرەوە دەکەن، لەگەڵ کلکی دووپشکەڕەشاندا لە نێو شیعری کلاسیکدا، بە یەکدی چوێندراون.

لەبەر جوانیان و سەرنجراکێشییان، زۆر شتی جوان بە خاڵان چوێندراون و خاڵیش بە گەلێك شتی جوان چوێندراون. لە کۆپلێکی نێو مەقامی ئازیزەیدا ئەم لە یەکدی چواندنە زۆر جوان خۆی دەنیوێنی، ئەگەر کوڕەلاوێك بە کیژە خاڵدارێکی دەڵێ:

وردە خاڵت بە من بمێنن، بە وەنەوشەی ساوا
ئەگەر هەوەڵی بەهارێ سەریان دێنایەوە دەرێ
لە بن کەویلکە کەویلەی بەفرێ، لە دامێنی ڕنووە بەفران و
خۆیان ڕادەژاند بە پشووی شەماڵی و
ملیان شۆڕ دەکردنەوە لەبەر بارانەی بەهارێ

لێرەدا، دیارە ئەم مل کەچکردنەی وەنەوشەی ڕەنگ شین، کڕنۆش بردنە بەرابەر خاڵی سەر گۆنای سپیی خاڵداران!

ئەمن پێم وایە، هیچ جواندۆستێك نییە ئەگەر لە هەر شوێنێکی، خاڵێکی ببینێ، وەبەر سەرنجانی نەدا، بەڵام هەر کەسێکیش بە

---

١ لاجانگ: ئەو بەشەی ڕوومەت، کە دەکەوێتە نێوان گوێ و چاو. (ئنستیتیوت)

گوێرەی ئارەزووی خۆی، خاڵی پێ لە شوێنێکی جوانترن، لە شوێنێکی دیکە، وەکو: خاڵی زەوینێ هەوەڵە بەهاران لە نێو پەڵە بەفران بە لاپاڵی چیایانەوە، خاڵی سەر مەزرای دەشتێ بە پەڵە نێرگزی مژدەی نەمانی زستانێ، خاڵی سەر چەرخی ڕوومەتێ، خاڵی قوڵکەی بەرگەردن و لالێوان، خاڵی سەر سینە و نێوانێ زەردمەمکان و ...هتد.

خاڵان ڕەنگیان زۆرن، بەڵام زۆرترینی ئەو خاڵانەی، کە پتر لە نووسراوان و شیعراندا باس کراون، خاڵەکانی ڕەش، یان شین، پتر لە نێو باساندا دیار و هەست بزێن و سەرنجڕاکێشن.

لە بارەی خاڵانەوە، شیعر زۆر گوتراون، زۆریش بە شێوەی جودا جودا بەکارهێنراون، ئەمن بە قوتابیەتی ئەم شیعرە نۆ وشەییەم لەبەر کردووە، کە لەبیرم نییە شیعری کام کەسێکییە لە خاڵپەرستان، کە لە کۆی نۆ وشە، حەوت خاڵی ماناداری زێدە قەشەنگی لە خاڵەکانی زەوییە، گیانەوەر، خاڵی مرۆڤی برای دایك و خاڵی سەر ئەندامی جوانێکی، کە ئاشقبەندانە پێکەوە سازاون و بە یەکدی ویستی و خۆشەویستانەش ئاوێزان بوون، کە دەڵێ:

خاڵخاڵە خاڵخاڵ، خاڵبەندی خاڵان
خاڵی خاڵخاڵە، گیرۆدەی خاڵە[1]

گەلۆویستانی خۆشەویست، هەر وەکو دەڵێن، بە کوردی و بە کورتی، خاڵی عاقرەوی، لە بنەچەدا عەقرەبی و عەرەبییە و بە خاڵی (ڕەشی ورد) دێت، ئەم وشە عەرەبییەش، چۆن هاتۆتە نێو ئەم مەقامە

---

١- ڕوباعیاتی خەییام، سەرچاوەی پێشوو.

کوردییە ڕەسەنەیەوە؟ دیارە ئەوەش وەڵامەکەی لە کن دانەری پەخشانە شیعری گەلۆیەکەمان وە دەست دەکەوێ، کە بە هۆی ئایینێوە و خوێندنی عەرەبی و مەلایانی پێشڕەوی ئایینی ئیسلامێ لە کوردستانێدا بووە، کە وێدەچێ ئەو کەسەش لە مەلایەکی ئەو سەردەمەی بەدەر نەبێ، جا ئەگەر ئەو وشە هەر چۆنێك و لە هەر شوێنێکیەوە هاتبێ، بێگومان جوانی هەر جوانییە، چونکە لە جوانییەدا وشەکە و یاساکە لە یەکدی وەشاوەییان وەکو ئەستێرەی گەلاوێژێ شەوی سامالّی تاریك، پێکەوە دلّگیر و سەرنجڕاکێشن!!

بێگومان بابەتەکەمان ئەوە هەلّدەگرێ کە لێرەدا باخێکی ڕازاوەی زەنوێر بۆ فێنکایەتییە دلّی و ڕووناکاییە چاوان، بکەینە دیاری بۆ فەرامۆشییە دلّی خوێنەرانی جوانپەرستی بەڕێز و خۆشەویست:

حەیرانی برۆ و خالّی لە ڕووی تۆیە وەفایی
بۆچی حەرەم ئاتەشکەدەیی پیری موغانە؟![1]

خالّۆ خالّۆتەن، کەم واچۆ خالّۆ
خالّۆ دەم وەبان خالاّنت مالّۆ[2]

خالّی ڕووت داخی دلّی زامار و بیماری منە
ڕوومەتت گولّ، قامەتی تۆ سەرووی جۆباری منە[3]

---

١- دیوانی وەفایی، سەرچاوەی پێشوو.

٢- دیوانی مەولەوی، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕس، چ(نەجاح)، بەغدا، ١٩٦١.

٣- دیوانی ئەحمەد موختار جاف، د.عیزەدین مستەفا ڕەسوولّ، بە یارمەتیدانی ئەمیندارێتی گشتی ڕۆشنبیری و لاوان چاپکراوە، چ(ئەدیب)، بەغدا، ١٩٨٦.

کوێستانان خاڵخاڵ، بەفری ناچێتۆ
یارم تۆراوە، ئاشتی نابێتۆ[1]

نییە دیدەیی چ مەردوم، نییە مەردوومی چ دیدە
لە فروغی خەددی فاریغ، لە خەیاڵی خاڵی خاڵیی[2]

١- فۆلکلۆری کوردی.

٢- دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو.

## وەستا موحەممەدی کۆیە و میدادی ئەڵمانیان و سەردەمی دانانی گەلۆی:

لە نێو جوانییەتییە هەموو جۆرە جوانییەکانی خشڵی بە خۆوەخستنی ئافرەتاندا، وەکو گەلۆبێژ دەڵێ:

"هیچیان ناگەنە خاڵێکی ڕەشی عاقرەوی نێوانی هەردوو زەردەمەکان

هەر دەڵێی نەخشە و وەستا موحەممەدی کۆیە سەر و بنی گرتۆتەوە لە زیوینە..."

گەلۆییانی خۆشەویست، لەو ڕۆژەیەوە ئەمن لەو ڕووەیەوە زۆرم گەڕان بە لاپەڕەکانی بیرکردنەوە و بۆچووناندا، بە هەویا ئەوەی لە نێو خەڵکانێکی تەمەندار و لە کتێباندا، دەربارەی ئەو وەستا موحەممەدە زێڕ و زیوکارەی کۆیە، چەند زانیارییەکم وەگیر بکەوێ، بەڵام ئەم کارەم هیچ ئەنجامێکی نەبوو، هەتا ڕۆژێکی بەهاری ساڵی ١٩٧٠، بە ڕێکەوت لە کۆیە لامدایە دوکانۆکەکەی مام سامی عەبدالی شاعیر، لەوێ لە نێوانی گوتوگۆیەکانماندا، ئەو بیرمەندە بە تەمەنە گوتی: "ئەوەی ئەگەر ئەمن دیتومە و بەبیرم مابێ، کۆمەڵێک پیاوی ناوداری کۆیەی ئەو سەردەمەی کۆیە، بۆ قسە و باسان هێندێک جاران لە دوکانی وەستا موحەممەدی زێڕنگەر، کاتیان بەسەر دەبرد، ئەو کەسانەش بریتی بوون لە: حەماغای گەورە، سێوەدیانی مەقامبێژ، مەلا عەبدوڵڵای جەلیزادە و چەند کەسایەتییەکی دیکەی کۆیە."

تامەزرۆ بووم باسەکە بگەیەنێتە کۆتایی، بەڵام لەو کات و دەمەدا

ئەمن بە کاری دیکەوە خەریك بووم و زۆرم پەلە بوو، جا لەبەر پڕکارییە خۆم نەمتوانی پتر لە بابەتەکەی کەندەکەوەی بکەم، بۆیە بە پێویستم زانی ویستەکەم بخەمە کاتێکی دواتر و لە دەرفەتێکی دیکەدا بچمەوە خزمەتیان. بەڵام ئەگەر لە دواتردا چووم بۆ کۆیە، مام سامی عەبدالّی شاعیر، کۆچی دوایی کردبوو. ئیدی لە بەدواداچوونانمدا بە نێو کتێب و سەرچاواندا، لە کتێبی (حەماغای گەورە)دا چەند زانیارییەکم وەدەستهێنان، کتێبەکەش لە لایەن خوالێخۆشبوو مەسعوودی مەلا موحەممەدی کۆیی هێنراوەتە بەرهەم، ئەمنیش لە بارەی کاری خۆمەوە، زۆرم کەڵك لەو کتێبەی وەرگرت. لە لاپەڕەکانی ئەو کتێبەدا هاتووە، کە حاجی مەلا عەبدوڵلای جەلیزادەی کۆیی و باپیری کاك مەسعوودی خاوەن کتێبی ناوبراو، لەگەڵ حەماغای گەورەدا ژیاوە، بەڵام بە چەندساڵێکان گەورەتر.

هەر وەکو لە کتێبی ناوبراودا و لە ئەنجامی لێکۆڵینەوە و بۆچوونانمدا، بۆم دەرکەوت حەماغا لە ڕۆژ و مانگ و ساڵی ۱۹۲۰/۸/۲۰ی زایینی و لە تەمەنی ۸٦ ساڵیدا کۆچی دوایی کردووە، دیارە بە گوێرەی ئەم لێکۆڵینەوەیەش بە کەمکردنەوەی ژمارە ۸٦ لە ژمارەی ۱۹۲۰ لە دایکبوونی حەماغای گەورە دەبێتە ساڵی ۱۸۳٤، واتە ساڵەکانی ژیانی حەماغای گەورە، دەکەونە نێوانێ ساڵەکانی ۱۸۳٤- ۱۹۲۰ەوە، جا ئەگەر مەلا عەبدوڵلای کۆیی کوڕی مەلا ئەسعەدی جەلیزادەش، وەکو لە کتێبی ناوبراودا هاتووە، بە حەوت ساڵان لە حەماغای گەورەتر بووبێ، واتا مەلا عەبدوڵلاش لە ساڵی ۱۸۲۷ی زایینی لە دایك بووە. یان وەکو گریمان دامانناا کۆچی دوایی

مەلا عەبدوڵڵاش هەر هەمان ساڵی حەماغایە و حەوت ساڵە بە مەزەندە گەورەترەکەی لێ دەردەهاوێن، دیارە دەبێتە ساڵی ١٩١٣ی زایینی.

هەر وەکو لە کتێبی باسکراودا نووسراوە، دوا کۆچی حەماغای گەورە بە شێوەیەکی دروست تۆمار کراوە و لە ڕۆژ و مانگ و ساڵی ١٩٢٠/٨/٢٠ی زایینی بووە، جا بە بۆچوونی مەزەندان، وێدەچێ ئەگەر ئەوانی دیکەش تەمەنیان هەر لەو دەورەبەرەیدا بووبێ، بەڵام بە کەمە جوداییەکی کەمتر و پترەوە، کە ئەم کەمە کەم و زۆر و کەمییەش، بە لای بابەتەکەمانەوە ئەوەندە نییە، کە گەلێك گرنگ بێت، ئەمەش لەبەرئەوەی گرنگتر ئەوەیە، کاتی سەردەمەکەمان بۆ دیاری دەکات. دیارە بەم لێکدانەوەش وا دەردەکەوێ، کە دانەرە پەخشانە شیعری گەلۆیەکەمان، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵێك لە ساڵەکانی هەزار و هەشت سەدەکان ١٨٠٠ی زایینی.

سەبارەت بە گوتەی گەلۆبێژەکەشمان، ئەگەر دەڵێ:

"... قامکی بە من بمێنن بە میدادی ئەڵمانییان

ئەگەر مەلا عەبدوڵڵای کۆیە، پێی دەکێشێتەوە نوختە و میل و خەتێ..."

وشەی قامك، پەنجەیە و، میدادیش مەرەکەبە. بە گوێرەی مانای دروست (حەقیقەتی) هیچ لێکچواندنێك لە نێوانێ مەرەکەب و قامکدا نییە، بەڵام بێگومان نیزیکییەك و پەیوەندییەکی پتەو لە نێوانێ پێنووس و مەرەکەبدا هەیە و هەر یەکێکیان بەبێ ئەوی دیکەیان، هیچ کارێکی پێ ناکرێ، واتا ئەگەر مەرەکەب نەبێ، پێنووس هیچ کارێکی پێ ئەنجام نادرێ و، دیارە کە پێنووسیش نەبێ، مەرەکەب بە

تەنێ هیچی پێ ئەنجام نادرێ، چونکە پێویستە لە کاتی کارکردنێدا هەردووکیان پێکەوە کاری هاوبەشیان هەبێ.

لە زانستی زمانیشدا، ئەگەر یەکێکیان هەبێ و یەکێکیان نەبێ، پێی دەگوترێ (نابێ نەبێ- مانعة الخلو)، بە مانای، پێویستە هەردووکیان هەبن. جا لەبەر توندوتۆڵییە نێوانێ هەردووك دروستییە پێنووس و مەرەکەبێ و یاسای ڕەوانبێژییە، ئەم دوو وشە ناوە، دروستە وەکو خوازراو گونجاوە، ئەگەر لەبری یەکدی بەکار بهێندرێن.

لێرەشدا میدادی مەرەکەب، وەکو پێنووس بەکار هێندراوە، قامکی خۆشەویستەکە دانەری گەلۆش، هەر بەو پێنووسەی چوێندراوە، ئەوەش بە هۆی باریکی و درێژی و لووسی و جوانییان. بێگومان لەو سەردەمەشدا پێنووس، قامیشی باریك بووە و دواتریش پێنووسی (ئووچ) پەیدا بووە و بەکار هێندراوە، وێدەچی ئەگەر ئووچی ئەڵمانیش، باشترین و جوانترینی جۆری پێنووسی تازەداهاتووی ئەو سەردەمەی خۆی بووە.

خودا لە قورئان و لە سوورەتی (کەهف – ئایەتی ١٠٩)دا وشەی میدادی ڕوونکردۆتەوە، وەکو دیارە مەلای دانەری پەخشانەشیعری گەلۆش، ئەم بیر و بۆچوون و بە یەکدییەوە بەستنەوە توندوتۆڵەی، لە فەرموودەکەی خودای مەزنەوە وەرگرتووە، چونکە دانەریش هەر وەکو زانا و ڕۆشنبیر و شاعیرەکانی دیکەی ئەو سەردەمەی، لە کلاسیکییە بەدەر نەبووە: "قل لو كان البحر مدادا لكلمات ربي لنفد البحر قبل ان تنفد كلمات ربي و لو جئنا بمثله مددا".

لێرەشدا ئاشکرایە کە مەرەکەب جێی پێنووسی گرتۆتەوە، بێگومان دیارە دانەرەگەلۆ، لە لێکچواندنێ هەر ئەنگوستێکی دەستی

خۆشەویستەکەی، بە پێنووسی دەستی یەزدانێ مەزنی گەورە نووسەر، ئەوپەڕی پیرۆزی داوەتە ئەنگوستی دەستی یارکۆڵەکەی خۆی، کە دیارە ئەنگوستەکەش و خاوەن ئەنگوست، هەر دەستکاری خودای جوان و جوانکارن، لێرەشدا بەم بۆن و بار و پەیوەندییەوە، وای بە چاک دەزانم، کە دوابەیتە شیعرێکی مستەفا بەگی کوردی بێنمە گۆڕێ، کە شیعرەکە لە دێڕی یەکەمیەوە هەتا دوایی، هەر دێڕێکی کوردی و دێڕێکی عەرەبییە و بێگومانم بیرەکەشی لە ئایەتی پێشووەوە وەرگیراوە:

چونکە نامەی دەردی (کوردی) قەت نەهاتە انتها
تمت القرطاس جف الحبر وانشق القلم[1]

وا باشە ئەگەر ئەوەشمان لەبیر نەچێ، شاری کۆیە لەو سەردەمەیاندا، مەڵبەندی گۆڕینەوەی کالای زۆر و جۆراوجۆری بازرگانی بووە، کە لە خۆراواوە لە موسڵ و هەولێر و، لە خۆرهەڵاتیشەوە لە شارەکانی سەردەشت و سابڵاخ بووە و، لەو شارانەشەوە بۆ شار و شوێنی دوورتر...هتد. بازرگانیکردنیش لەو سەردەمەیدا پێی گوتراوە (قەتار)، بێگومان لەم کڕین و فرۆشتن و تێکەڵی و یەکدی ناسینەشدا، باسکردنێ جۆرەها بابەتی لە یەکدی جودای زۆر کراون، کە بابەتێکیش لەم بابەتانە، بابەتی وێژەیی بووە بە هەموو جۆرەکانییەوە، کە بە زۆری لە یەکدییەوە وەرگیراون و بڵاوبوونەوە، بێگومان لەو پێکەوە دانیشتنانەی شەوانیشدا، کەسانی

---

١- دیوانی کوردی، سەرچاوەی پێشوو.

کاروانچــی دەنگخــۆش بــە دەنــگ و ئــاوازە جۆراوجۆرەکــانی ئــەو ســەردەمەی، زۆر بابــەتیان بــە گــوێی یەکــدی ئاشــنا کــردووە، کــە ئاوازێکیش لەو ئاوازانە، مەقامی گەلۆی باسەکەمان بووە.

ئەمن بۆ خۆم وام دێتە بەرچاوان، بە تێراهەڵدانێ ئەو مەقامە بە سۆزەی، زۆریان سەر بە دانیشتوان و گوێگران و ڕاژاندووە و شەوی ســاردی پاییزێیــان پــێ بەســەر بردبــێ و چایچــی و (خانچــی)یش گەیشتبنە باوێشکدان و وەنەوز و مل شۆڕبوونەوە و چاونوقاندن و لە نەکاو سەر بڵندکرن و چاوهەڵێنان و هۆشیاربوونەوی...

## تەختی سولەیمان پێغەمبەری:

هــەر وەکــو لــە دێــر زەمانــەوە زانــدراوە زەوینــێ فەلەســتینێ، خــاکی پەیــدابوونێ پەیامبــەران بــووە، پەیامبــەرێکیش لــەو پەیامبەرانــە، ســـولەیمانی کـــوڕی داود پێغەمبـــەر بـــووە، وەکـــو دیـــارە هـــەر پەیامبـــەرێکیش توانـــا و بـــەهرێکی تایبـــەتیی خـــۆی هـــەبووە، خوداوەنــدیش، بێجگــە لــە دەنگخۆشــییەکەی، توانــای بــەهرەی ئاســن نەرمکردنێشــی بــەو پەیامبــەرەی بەخشــیووە، هــەر لەبــەر ئــەو بــەهرە گــرنگ و توانایــەش ئــەو پیــاوە لــە هــەموو ژیانێیــدا هــەر کــاری ئاسنگەرییەتی، کردووە بە پیشەی ژیانی خۆی، بۆ بەڵگەش، لە باسە فۆلکلۆریە کوردییەکاندا، لە نێو داستانی پاڵەوان و شەڕ و هەرایانــدا، زرێی داودیی باشترین زرێــی شــەڕێ ســەردەمی خۆی بــووە. لــە بــارەی

دەنگخۆشیشـەوە، هـەر کەسـێك ئەگـەر دەنگـی زۆر خـۆش بووبێـت، دەنگەکەیان بە دەنگی داودی پەیامبەر چواندووە.

عومەری خەییام، لە چوارینەیەکی زۆر شیرینی خۆیـدا، زۆر شیرین باسی لە لەرەی دەنگی خۆشی داود پێغەمبەر کردووە:

بـــێ بـــادە مەبـــە، مـــوڵکی مـــەحموودە
گـــوێ بگـــرە لـــە دەنـــگ، لـــەرەی داودە
لـــە هـــاتن، لـــە چـــوون، ئەندێشـــە مەکـــە
کـەیف بکـە ئێسـتە، ئێسـتە مـەوجوودە[1]

سولەیمانیش، کـە لـە دوای داود پەیامبـەری بابییـەوە پەیامبەرییـەتی پێ بەخشراوە، خوداوەندی میری مەزن چەند بەهرەیەکی زۆر گرنگیی داوەتـێ، کـە یـەکێك لـەو بەهرانـە، زانینـێ زمانـێ سـەرجەمی باڵـدار و گیانـداران بـووە، هـەر وەکـو لـە قورئانێـدا باسـکراوە: " وَوَرِثَ سُلَيْمَانُ دَاوُودَ وَقَالَ يَا أَيُّهَا النَّاسُ عُلِّمْنَا مَنطِقَ الطَّيْرِ[2]"

ڕۆژێکی سولەیمان کۆبوونەوەی بە باڵداران و گیانداران کردووە، بەڵام لـــەو کۆبوونەوەیەیـــدا پەپووســـولەیمانە لـــەوێ نـــەبووە، لـــە بەسەرکردنەوێشـدا دیـار نـەبووە، سـولەیمانیش چـاوی بـۆ گێـڕاوە و نەیـدیتووە و پرسـیویەتی بۆچـی پـەپوو دیـار نییـە؟ وێدەچـێ ئەگـەر نەهاتبێ! کوا لە کوێیە؟ "مَا لِيَ لَا أَرَى الْهُدْهُدَ أَمْ كَانَ مِنَ الْغَائِبِينَ[3]"

هەر لەوێ سولەیمان بڕیاری بۆ داوە ئەگەر هاتەوە و بەڵگەی دروست

---

١- چوارینەکانی عومەری خەییام، سەرچاوەی پێشوو.

٢- قورئان، سوورەتی النمل، ئایەتی ٦.

٣- قوڕئان، سووڕەتی النمل ئایەتی ٢٢.

و سەلمێنەری هۆی ئامادەنەبوونەکەی پێ نەبوو، ئازاری بدا و سەری ببڕێ، لەو دەمەشدا پەپوو پەیدا دەبێتەوە و لە لایەك و لە نزیکەوە گوێی لە گوتەی هەڕەشەی سولەیمانی دەبێ و دێتە پیشێ و بەرەو ڕوو بە سولەیمانی دەڵێ: ئەوەی دیتومە و دەیزانم، ئەتۆ نایزانی و لە بارەیەوە بێ ئاگای، ئەمن ئێستی لە یەمەنێ هاتوومەوە و مژدێکی خۆش و دروستم بۆ هێناوی!

سولەیمانیش پێی دەڵێ: بڵێ بزانم! پەپوو وەڵامی دەداتەوە و پێی دەڵێ: "أَحَطْتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِ وَجِئْتُكَ مِنْ سَبَإٍ بِنَبَإٍ يَقِينٍ[1]" ئێستا ئەمن ئافرەتێکم دیتوە، خاوەنی سامانی زۆر و وڵات و دەسەڵاتە و کۆشکێکی گەلێك مەزنیشی هەیە: "إِنِّي وَجَدتُّ امْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ[2]"

هەر ئەو کاتەی سولەیمان نامەیەکی بە پەپوویدا بۆ ئەو ئافرەتەی ناردووە و بۆی نووسیووە، ئایا ئەتۆ خۆت لە من بە گەورەتر دەزانی! وەرە بۆ لام موسڵمان ببە "الا تعلوا علي واتوني مسلمين[3]" هەر ئەو دەمە پەپوو نامەکەی بردووە بۆ (بەلقیس)ێ و گەڕاوەتەوە. هەڵبەتا ناوی ئەو ئافرەتە بە عەرەبی دەنووسرێ (بلقيس) بەڵام لە قوڕئانێدا هەر بە ئافرەت (امراة) ناوی هاتووە و جوانترینی ئافرەتی سەردەمی خۆیشی بووە.

لە باس و داستانە وێژەییە کوردییەکانیشدا، وەکو گۆرانی بە (بەڵقیسا) زۆر ڕێزدار دەدرەوشێتەوە و، زۆر کچی کوردیش لە کۆندا

---

١- قوڕئان، سوورەتی النمل ئایەتی ٢٢.

٢- قوڕئان، سوورەتی النمل ئایەتی ٢٣.

٣- قوڕئان، سوورەتی النمل ئایەتی٣١.

ئەو ناوەیان لێ نراوە، بەڵام ناوەکە لە (بەڵقیس)ەوە گۆڕاوە و بووە بە (بەڵکیس) و ئێستێش لە هێندێك شوێناندا وەکو سەرەژن بە پوور بەڵکیس و نەنە بەڵکیس، ناویان وەبەر گوێیان دەکەوێ، یان بە سەری سپی و ڕووی گەشەوە دەبیندرێن.

گەلۆ، ئەم باسەش وەکو هێندێك لەو باسانەی لە نێو بابەتەکەمان و بە کورتی ئاماژەیان پێکراوە، بۆ ئێمەش ناگونجێ بە درێژی لەسەری بنوسین، چونکە لە ئەسڵی مەقسەد دوورمان دەخاتەوە، ڕەنگبێ بۆ تێگەیشتنێش ئەوەندە بەس و باش بێ کە لێرە لێی دواوین.

وەکو دیارە و ئاماژەی پێکراوە، هەر ئەگەر نامەی سولەیمان پەیامبەری پێگەیشتووە، هەر ئەو کاتەی بە خۆی و بە تەخت و دیارییەوە، لە یەمەنێوە گەیشتوەتە فەلەستینێ و لەوێش لەبەر دەرکێ کۆشکێ سولەیمانی دابەزیوە و سولەیمانیش ئەو کارەی گەلێك پێ خۆش بووە.

تەختی زەوینێ کۆشکەکەی سولەیمانی، لە شووشێکی لووسی شینی کاڵی ئاوی دروستکراو بووە. سولەیمان داوای لە بەڵقیسێ کردووە، کە بۆ سەر کۆشکەکەی سەر بکەوێ، بەڵقیس کە خەریکی سەرکەوتنێ بووە، وای زانیوە ئەگەر تەنکە ئاوێکی ڕاوەستاوە، جا بۆ ئەوەی کە تەڕ نەبێ، کەمێکی کراس و ئاوەڵکراسەکەی هەڵکێشاون و بەلەکی سپی و خڕ و لووس و تورتی بەدەرکەوتوون، سولەیمانیش لە دوایەڕا پڕا و پڕی چاوان، تەماشای پاو و پووزی قەشەنگی دەستکردی خوای مەزنی کردووە و گووتویەتی: "هذا من فضل ربي"[١]

---

١- قورئان، سوورەتی النمل ئایەتی ٤٠.

ئەمن پێم وایە سولەیمان، ئەوەندەی ئەو بەلەکە سپییە و پاژنە زەردە هەنجیریەی پێ جوان بووە، ئەگەر لەبەر بەپەلە بردنە ژووڕێی نەبایە، چەند جارێکی دیکەی چوونەسەر و هاتنەخوار بە بەڵکیسە خانێ دەکرد!

قورئان بەم شێوەی، ئەم بەخێرهاتنەی خانمەکەمان بۆ باس دەفەرموێ: " ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَنْ سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُمَرَّدٌ مِنْ قَوَارِيرَ"[1]

شێخی سەعدیش لەم ڕووەوە جوانی گوتووە:

کێ دەڵێ تەماشاکردنی جوانان حەرامە
ئەمن دەڵێم تەماشانەکردنیان، حەرامە!

دیارە ئەو تەختی سولەیمانەی ئەگەر لە مەقامی گەلۆی باسەکەماندا هاتووە و مامۆستای دانەر و گەلۆبێژ و گەلۆویستان، بە خۆشی و شانازییەوە ئەو شێوە لە یەکدی چواندنەیان بە جوان زانیوە و هەتا ئێستێش هەر دەیڵێن و دەیڵێنەوە و گوێدێریش سەری خۆشی و ڕەزامەندیانی بۆ ڕادەژێنن، تەنیا هەر ئەو تەختەی بەڵقیسایە بووە، کە بە دیاریی زۆرەوە بەڵقیسی بۆ سولەیمان پەیامبەری هێناوە.

لە مەقامی گەلۆیەکەشماندا، دانەر سینەی خۆشەویستەکەی بەو تەخت ودیارییەی چواندووە، کە زێڕ و زیوی دیاریی بەڵقیسێیە بۆ

---

١- قورئان، سوورەتی النمل ئایەتی ٤٤.

سولەیمانی، جووت مەمیشی دیارییە یەزدانی مەزنە بۆ پەرەپێدانی ژیانێ مرۆڤان و نەبڕانەوێ ئاوەدانییە سەر زەوییەیە.

جا لە دوای جێگیربوونێ بەڵقیسێ لە نێو کۆشکی سولەیمانیدا، سولەیمان لە پاداشتی ئەو کارە چاکەی پەپووی کردوویەتی، بانگی کردووە و تاجی زێڕی بە خەڵات پێ بەخشیووە و لەسەر سەری داناوە، پەپووش، لە (پەپوو)ەوە، بووەتە (پەپو سلێمانە).

دیارە پەپوو ئەو بەخششەی، بە مافی ڕەوای خۆی زانیوە، جا لەبەر ئەوەی هەتا ئێستێش و هەمیشە لە نێو باڵداراندا شانازیی پێوە دەکا و، زۆر جاران بۆ خۆ نمایشکردنێ، تاجەکەی دەپێچێتەوە و ڕووی پێ لە ئاسمانێ دەکا و، هێندێك جارانیش وەکو باوەشێنی دەستی خانمان، بڵاوی دەکاتەوە و بە خۆشییەوە خۆی پێوە ڕادەنێ!!

گەلی دۆستان و برادەران، تنۆکە ئاوی نێو قوڵکەی بەرگەردنێ جوانانی وەکو بەڵقیسە خانیش، ئەگەر لە کاتی گەرما و ماندووبوناندا لەو شوێنەیدا کۆ دەبنەوە و ئارام دەگرن و جارجارەش بە زنجیرە بە دوای یەکدیدا دێنە خوارێ و ڕێچکەبەست شۆڕ دەبنەوە، بۆ نێوانێ جووتە مەمیەی نێو باخی ساوا.

دیارە ئەم قوڵکەش، بە دڵۆپە ئارەقەکانییەوە بە کانیاوی کەوسەرێ بەهەشتێ چوێندراوە، کە ئەویش کانی و ئاوێکە لە کانییەکانی بەهەشتەکەی خودای، دیارە ئەگەر ئەو شوێن و ڕەز و باخەش، هەموویان لە خۆشی و جوانیاندا لە یەکدی وەشاونەوە، هەر لەبەر ئەوەشە قوڵکەی بەر گەردنێی پێ چوێندراوە، بێگومان ئەو کانی و شوێنە خۆشەش، بۆ ئەوەیە ئەگەر لە ڕۆژێ دوایی ئەو زیندووبوونەوەی، کە جارێکی دیکە مردنی لە دوا نییە، وەکوپاداشت

و دیاریی، خودای مەزن بۆ مرۆڤە باوەڕدار و چاکەکانی خۆی ئامادە کردووە، کە ئەو مرۆڤە باوەڕدار و چاکانە لە دەوری کانییەکەی دادەنیشن و لە درەختی بەرز و بە لك و پۆپی توبایەش، هەر چی ئارەزووی بکەن لە جۆرەها میوە و خواردەمەنیش ئامادە کراوە و هەیە، لە ئاوێ خۆش و سارد و سازگاری کانی کەوسەرێش نەوشی گیانیان دەکەن...

لە باسەکەشماندا کۆشك و تەلار و تەختی فەرمانڕەوایی و مەزنییە لە نێو قورئانێدا بە عەرش ناو براوە، هەر وەکو لە سوورەتی (النمل)دا کۆشکی بەڵقیسێ لەو ناوەیەوە هاتووە: "ولها عرش عظیم"

## شەجەرەتوبا:

لە نێو پەڵە وشەجارەکانی پەخشانە شیعری گەلۆیدا، وشێکی لێکدراو بە ناوی (شەبرەتوبا)وە، دیار و درەوشاوە دەشەکێتەوە، ئەم وشەش بە بۆچوونی من، وشێکی بە هەڵە گۆڕدراوی نامۆیە بەم ناوەوە هاتۆتە نێو دەقی باسەکەمانەوە، جا بۆ دیتنەویَ دروستی ڕەگەزی ئەم وشە زۆر دەگمەنەی، کەوتمە بەدواداچوونان، بەڵام لەم گەڕام و پرسیارکردنانەمدا، هیچ ساغکردنەوێکی بڕوهاتووم[1] وەدەست نەکەوت، ئەوجا لە دواتردا کەوتمە لێکدانەویَ چۆنییەتییە دروستبوون و بەکارهێنان و جێگە و پێگەی وشەکەی، لە نێو ڕستەی دەقەکەیدا.

دانەری گەلۆی، بە خۆشەویستەکەی دەڵیَ:

"... ئەمن لانکێکت بۆ دروست دەکەم

نێو تەختەی لە گوڵیَ، لە گوڵەڕۆنیَ

تەختەی بۆ دەکەم لە دارەکەی شەبرەتوبایە..."

جا لە لێکدانەویَ چۆنییەتییە بەکارهێنان و پێکهاتەی وشەکەمان، لە نێو ڕستەی کەرەستەی تەواوی دروستکردنیَ لانکیَ منداڵەکەیدا، لە تەختەداری (شەبرەتوبا)یە، بەڵام بۆم دەرکەوت ئەگەر وشەی (شەبرە) ڕاست و دروست وشەی (شجرة)ی عەرەبییە و لە بەکارهێنانیَ لە کاتی گەلۆیدا، نەخوێندەوارانە و نەزاندراوانە، گۆڕدراوە بۆ وشەی شەبرە و بە لێکدراوییە دوو وشەییش، هەردووک

---

1- بڕوهاتوو: قەناعەت پیَ هاتن، پیَ تێربوون، شتێك كە لە لایەنی مەعنەوی یا ڕوحییەوە تینوێتی یا برسێتی بشكێنێت. (ئنستیتیوت)

ناو، بوون بە (شەبرەتوبا)، ئەمجار لەویشەوە وشەکە بۆتە (شەبرە توبا)ی بە هەڵەی باوی نێو بابەتەکەمان. جا، گەلی دۆستان و برادەران و تێکڕای گوێگرانی مەقامی گەلۆیەکەمان، شەوێکی لە نێو نوێنی نووستنێ و لە بیرکردنەواندا لە نەکاو بە بیرمدا هات، کە ئەمن (شجرة طوبی)م لە نێو قورئانێدا دیتوە، بەڵام نەدەهاتەوە یادم ئەگەر وشەی ناوبراوم لە نێو وشەکانی کام سوورەتێدا و لە چ ژمارەی ئایەتێکیدا وەبەر چاوان هاتووە.

بۆ شەوی دواتر، کە خەریکی ئەم وشە قورئانی و درەختە بەهەشتییەی بووم، بۆ زانینێ دیتنەوێ وشەی ناوبراو، لە گوتوگۆیەکی تەلەفۆنیدا، لە (د. موحەمەد عەبدولباقی) مامۆستای زمانی عەرەبی لە زانکۆی ڕاپەڕین-م پرسی، کە ئەو وشەیە لە کام سوورەتەیدایە؟ بەڕێزیشی وەکو وەڵام پێڕاگەیاندم، کە ئەو وشەیە بەم شێوەیە لە سوورەتی (الرعد)دایە و ئایەتی ژمارە ٢٩یە، کە خوا فەرموویەتی:

"الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ طُوبَىٰ لَهُمْ وَحُسْنُ مَآبٍ"، واتا ئەوانەی بڕوایان هێناوە و کردەوەی چاکیان کردووە، بەشیان لە داری (تووبا)یەدا، لەگەڵ بەختەوەریە باشدا، هەیە.

هەتا مامۆستا ئەم زانیارییەی پێڕاگەیاندم، بۆ خۆشم هەر ئەو شەوەی لە ئایەتی ٢٤ی سوورەتی ئیبراهیمدا، بە شێوەیەکی دیکە دیتبوومەوە، کە میری مەزن، بە بەڵگەی ئامۆژگاریکردن لە بارەی وشەی باشەوە بۆ پەیڕەو لەسەر ڕۆیشتنێ بەندەکانی، خۆی باسی ئەم درەختەی کردووە و فەرموویەتی:

" أَلَمْ تَرَكَيْفَضَرَبَ اللَّهُ مَثَلًا كَلِمَةً طَيِّبَةً كَشَجَرَةٍ طَيِّبَةٍ أَصْلُها ثابتٌ وَفَرْعُهَافِيالسَّمَاءِ " واتا: "ئەی مرۆڤینە ئێوە نابینن و نازانن ئەگەر گوتەی چاك و باش، وەكو درەختی چاك و باشە، كە ڕەگەكانی توند چەقاوە و لك و پۆپەكانیشی بەرەو ئاسمان بڵند و بڵاو بوونەوە"...

بێجگە لەوەش، جارێكی دیكە خودا بۆ تەواكردنێ ئایەتێ پێشوو، لە ئایەتی ٢٥ی هەمان سووڕەتدا بەمجۆرە تەواوی دەكات، كە دەفەرموێ:

" تُؤْتِيأُكُلَهَاكُلَّ حِينِبِإِذْنِ رَبِّهَاوَيَضْرِبُ اللَّهُ الْأَمْثَالَ لِلنَّاس لَعَلَّهُمْيَتَذَكَّرُونَ" واتا: "ئەم درەختە بە فەرمانی خودای خۆی، بەخشندانە خواردەمەنی پێویست دەدات بە پیاوچاكان لە هەموو كاتانـدا، خوداش ئەم نموونانە بۆ ئاگاداركردنەوێ خەڵكی دەهێنێتەوە، هەتا بیر لە چاكەكردنێ بكەنەوە".

وشەی (توب- طب) وشەیەكی عەرەبییە و گەلێك مانای لە یەكدی نزیكی وەكو وشەكانی تەندروستی، چاكی، باشی و خۆشیی تێدا بەدی دەكرێت.

لە نێو كوردانیشدا ئەم وشە، وەكو ناوەكانی مرۆڤێ نێر و مێ بوونی زۆری هەیە و جێی خۆی كردۆتەوە. دیارە وشەكە بۆ مرۆڤی نێرینە (تەیب- طیب) بەكار هاتووە و بۆ ڕەگەزی مێیانیش ناوی توبا بەكارهاتووە، كە لە ناوی عەرەبی (طوبی، طابة، طیبة) وەرگیراوە.

بێگومان ئەم درەختەش بەو هەموو ئاكارە چاك و بەهەشتی و قورئانییەوە، درەختێكی زێدە پیرۆزە و، لە بارەی جوانییەتییە ڕەنگ و بۆنیشەوە، درەختێكی بە لك و پۆپ و بە كەڵكە و دیار و

درەوشاوەیە، هەر بۆ بەڵگەی وشە سەلماندنێش، شیعری چەند شاعیر دێنینە پێش دیتەی بەڕێزتان:

کە دەستمدا دەری دڵ بوو، نەدڵ بوو، گوڵشەنی گوڵ بوو
هەموو نەسرین و سونبول بوو، قەرەنفول بوو نەخلی توبایە[1]

ئەمن لە لێکدانەوێ ئەم شیعرەیدا، وای بۆ دەچم کە وەفایی دەچێ بۆ سەردانێ خۆشەویستەکەی، بەڵام وێنەی وێناکراوی ئەو خۆشەویستەی لە بیر و هۆشانیدا ئافرەتێکی جوانی ڕازاوەیە بە بەرگی ڕەسەنی کوردییەوە، کاتێکیش کە بە دیدار شاد دەبێت، دەبینی خۆشەویستەکەی وەکو باخچەی گوڵانێکە پڕە لە گوڵی زۆری هەمەجۆر، باڵایەکەی لە نێو ئەم باخچەیدا، وەکو باڵای داری خورمایە! لك و پۆپەکەشی لە جوانییەدا وەکو گوڵەمێخەکی جوان و بۆنخۆشن. دیارە وەفاییش خۆشەویستەکەی بە شێوەی ئەو گوڵ و گوڵزار و درەختەی چواندووە، لە نێو ئەم باخچەیەشدا باڵای خۆشەویستە گوڵگوڵییەکەی وەفایی بەتەنێ وەکو درەختی توبای باخی بەهەشتێیە، کە گوڵ چاوی سەرنجانی بەرابەر ڕادەگرن. ئەو درەختەش بە عەرەبی پێی دەگوترێ (شجرة طوبی)، کە لە کوردیدا، گۆیندەی گەلۆی، پێیدەڵێن (شەبرە تووبا).

هەر لە بارەی ئەم درەختە پیرۆزەشەوە، سالمی شاعیر دەڵێ:

بێ ڕەوانم ئەگەر نەدا بۆسە
وەسڵی دولبەر درەختی توبایە![1]

---

١- دیوانی وەفایی، سەرچاوەی پێشوو.

وشـەی ڕەوان، بـە مانـای (گیـان، ڕوح) دێـت و وشـەی بۆسـەش بـە ماچ، تێکڕای مانایەکـەش ئەوەیـە: ئەگـەر ماچم نـەداتی، بـێ گیـانم، بەڵام ئەگەر ماچم بداتێ، بێگومان وەکو ئـەوە وایە لە بەهەشتێدا بم و خۆشەویستەکەشم حۆری بێ و لـە نێـو کۆشـکێکیدا لەسـەر کانییـە کەوســـەرێ و لـــە بـــن درەختـــی تووبایـــەدا، خـــەریکی بـــەزمی خۆشگوزەراندنێ بم.

هەر لەم ڕووەشەوە مەلا مەحموودی بێخود فەرموویەتی:

لـە سـایەی نـەخلی تووبـای قامـەتی ئـەو نەونیهالـە
سلێمانی بەهەشتی عەدلە، یەعنی پڕ لە غیلمانە[2]

لە ژێر سێبەری فەرمانڕەوایەتییە ئەو باڵا بڵندەیدا، کە وەکو داری تووبـای بەهەشـتێیە، شـاری سـلێمانی ئـارام و دادپـەروەرە و زۆری گـەنجی قـۆزی تـازە پێگەیشـتووی تێگەیشـتووی خـاوەن ڕەوشـتی جوانی تێدایـە، کـە لـە ڕەوشـت بەرزیـدا، ئەوەنـدەی درەختـی تووبـای بەهەشتێ بەکەڵکن، ئەو فەرمانڕەوایەش لە کاتی پێویستیدا سێبەری لەسـەر سـەری هەموانـە، هـەر وەکـو درەختـی ناوبراوی بەهەشـتێ، کـە سێبەر و بەرهەمی بۆ خۆشی و بەختەوەرییـەی تێکڕای بەهەشتییانە، ســـلێمانیش لـــە ســـایەی ســـێبەری ئـــەو فەرمانڕەوایەتییەیـــدا دادپەروەرییەکـــەی ئەوەنـــدە دروســـت و بـــەربڵاوە، زۆر لـــە دادپەروەرییەکەی ژێر درەختی تووبای بەهەشتێ دەچێ، ئەگەر درۆی

---

١- بەدەم ڕێگاوە گوڵچنین- کتێبی یەکەم، نەوشیروان مستەفا ئەمین، لە بڵاوکراوەکانی الدار العربیة للعلوم ناشرون، چاپی یەکەم، چ(الدار العربیة)،لوبنان، ٢٠١٢.

٢- دیوانی بێخود، سەرچاوەی پێشوو.

لێ ناگوترێ، دزی لێ ناکرێ، کەس ناوی شەڕ و ئازاردانێ نازانێ، چاکە و ڕێزگرتن و خۆشی و خۆشەویستی و یەکدیویستی، بە ئاکامی دڵانە و پێداویستیی خۆشگوزەراندنی، بۆ هەموانە. دیارە سەرتاپای سلێمانیش لەو شیعرەیدا، بەو بەهەشت و درەختەی چوێندراوە، کە وێدەچێ فەرمانڕەوای ئەو سەردەمەش هەر شێخ مەحموودی نەمر بووبێ.

لە بارەی درەختی توبایەوە، مامۆستا دکتۆر موحەممەد عەبدولباقی، لەو پەیوەندییە تەلەفۆنییەی کە پێشتر ئاماژەم پێدا بوو، گوتی: لێکدەرەوان لەسەر ئەو درەختەی زۆر قسە دەکەن و دەڵێن:

* درەختەکە، درەختێکی زۆر بڵند و گەورەیە لە بەهەشتێدا، کە بە درەختی بەهەشتێ (شجرة الجنة) ناسراوە.

* وشەی توبا (طوبی) بە زمانی عەرەبیی لەهجەی یەمەنی، بە (گەورە) دێت.

* "ان هذة الشجرة لها ضروع" واتا لکەکانی ئەم درەختە وەکو گۆپکەی مەمکی ئافرەتان، خواردن و خواردنەوەی هەمەجۆریان هەیە، هەر وەکو خودا باسی لێوە دەکات و دەفەرموێ:

"کل ما تشتهي الانفس و تلذ الاعين"

# وشە لە نێو گەلۆیدا

لە بیرکردنەوە و لێکدانەوە و هەڵسەنگاندندا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ، ئەگەر دانەرە پەخشانە شیعری گەلۆیەکەمان، زۆر ڕۆچووەتە نێو قوڵایی دروستبوونی تێکڕای هەبوونێ و سەرجەمی ژیانێ زیندەوەران و یەکدی تەواوکردنێ و ژیانێ دێرین و هەمیشەیی هەموان.

دانەر، ڕووی خۆی لە هەر لا و شوێنێکی کردووە، دروستکار و ڕێکخەرێکی بە توانای دەسەڵاتداری بەهێزی دیتوە، کە ئەم بوون و بوونەوەرەی دروست کردووە و بە جۆرێکی ڕێکوپێک، هەڵیدەسووڕێنێ و بەڕێوەی دەبا. هەروەها دانەر، تێکڕای جوانییەکانی جەستەیی و ئاکارەکانیشی هەر بۆ بەخشندەیەتییە، ئەو زانا و بەتوانا و دەسەڵاتدارەی، ئەفرانەدەی خودی خۆی و هەر هەموان، گێڕاوەتەوە.

دانەر لە ڕۆنانی بابەتەکەیدا، وەکو ڕۆشنبیرێکی گەورەی سەردەمی خۆی، فەرموودەکانی پەروەردەگاری کردووە بە سەرچاوەی لێ هەڵێنجانێ کەرەستەی نێوەرۆکێ نووسینەکەی خۆی. جا لەبەر ئەوەی، ئەمن وای بۆ دەچم، کە ئەوەندە زۆر بە پارێز و وریایی و زانایییەوە، دابەزیوەتە سەر بیر دەربڕینێ و نووسینێ وشەڕێکخستنێ و ڕستەسازییە، کە گچکەترین هەڵەکردنی بە لادان لە ڕێبازی ڕوونبێژیە زانیوە.

لەم بارەشەوە دیارە ئەگەر خۆ پارێزییەتی زۆر بەکار هێناوە، تەنانەت ئەو خۆشەویستە ناو نادیارەی، کە هەیبووە، یان بۆ خۆی لە

نەبووەوە دروستی کردووە و بیری تیژ و چالاك و هەموو کاتی خۆی بۆ تەرخان کردووە و لە ڕوانگەی خودا و ئامۆژگارییەکانییەوە تەماشای کردووە، کە خودا فەرموویەتی "مرۆڤمان لە باشترین شێوە ئەفراندووە" هەر وەکو مەلا نالی لە نەبووەوە (حەبیبە)یەکی کردووە بە ڕووگەی خەیاڵاتی هەر هەموو ژیانیٚ و، بیری خۆی بۆ گوشیوە و ڕیسووەکەی بۆ کردووە و بە شیعر و پێیدا هەڵداوە، هەر وەکو دەڵیٚ:

ئاسمانی حوسنی مەحبووبەم، بە ئەبرۆ و زوڵف و ڕوو،
دوو هیلال و دوو شەو و دوو ماهی تابانی هەیە[1]

وێدەچیٚ ئەگەر دانەری پەخشانە شیعرەکەی، دانەری ئاوازەکەشی بوویٚ و بەدەم لێرەلێرێوە[2]، وشەی هۆنیبنەوە و کردبنی بە ملوانکە و بە گەردنیٚ زەردی خۆشەویستەکەیدا شۆڕ کردبنەوە، بۆ نێوانیٚ جووتە سێوی باخی ساوای سەر سینەی نەرم.

بەداخەوە، خاوەنی زانا و دانای گەلۆی، نادیار و بزرە، جا ئەگەر هەر کەسێك بیٚ، ئەو لە ڕیزی ڕێزدارانی هەموو مرۆڤە جوانپەرستەکانە. لێرەدا گرنگ ئەوەیە بڵێین پارچەیەکی ئەوەندە بەنرخی وێژەیی بۆ بەجێهێشتووین، کە وەکو کورد، میداڵی شانازییە سەر دڵیمانە.

---

١- دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو.

٢- لێرەلێر: نارەنار، گووتنی گۆرانی لەبەر خۆوە و بە دەنگی زۆر نرم. (ئنستیتیوت)

گەلۆییانی خۆشەویست، لە ئەنجامی بڵندبوونەوێ بە ئاوازگوتنی گەلۆی، لەلایەنی گۆیندانەوە بە دەما و دەمی، گۆڕانگاری لە دەقە ڕەسەنەکەیدا کراوە، ئەوەش وەکو ئەو خاڵانەی خوارێ:

١- وشەی عەرەبیی ئیسلامیی تێدا بەکار هاتووە، بەڵام گەلۆبێژانی نەخوێندەواری کورد، ئەو وشە عەرەبیانەیان وەکو خۆیان بەکار نەهێناوەتەوە، بەڵکو بە هەڵە گوتویاننەوە و ماناکانیشیان نەزانیون، ئەوەش وەکو دەربڕینی ناوی درەختی (شجرة طوبى) بە شەبرە توویا، یان وەکو بەردی خوای (صخرة الله)ی، کە زۆر جار بە (سەغرەتوڵڵا)یە و، ئیدیکە و ئیدیکەش... جا لەبەر ئەو وشە بە هەڵە گوتراوانە، بە پێویستم زانی وەکو خۆیان ڕاستیان بکەمەوە و بە گوێرەی کەمە توانایەکەشم، ڕوونکردنەوەیان بخەمە بەر چاوی گەلۆبێژانی نوێ، بۆ ئەوەی بە شێوەیەکی دروست و ڕەوان، هەواری خامۆشی گوێی گوێدێرانی پێ ئاوەدان بکرێتەوە و تام و چێژی گەلۆی، سەریان پێڕاژێنێ و فەرامۆشیانییان پێ ببەخشێ.

٢- چەندبارەبوونەوەی سەروایەکان: بێگومان و ڕوونە ئەگەر چەندبارەبوونەوێ سەروایەکی، لە نێو دەقی درێژدا وەدەردەکەون، هەر وەکو لە دەقەکەی ئێمەشدا، بێچارانە ئەم کارە دەبیندرێ. ئەم کارەی چەند بارەبوونەوە، لە نێو هەردوو چامە شیعریەکانی نالی و سالمیشدا، وەکو شیعری عەروزی عەرەبی، بوونیان هەیە. ئەمەش وەکو شیعرێکی کە وشەی سەروای لە زمانی کوردیدا بە کەمی هەبێ، ناچارانە وشەی ناسراوی زمانێکی دیکە بەکار دەهێندرێ، وەکو سەروایەکانی

نێو شیعری (دەردی حەبیب)ی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، کە هەر هەموو سەروایەکانی، وشەی عەرەبین، ئەوانەش وەکو وشەکانی (حەبیب، تەبیب، نەجیب، ڕەقیب)، خۆ دیارە ئەگەر نەبوون و بێچارەیی ڕێگە پێدراوە و، وشەکانیش لە نێو کوردانـدا زاندراون. هەرچەندە بابەتەکەمان شێوە داڕێژراوی عەرووز نییە، بەڵام دیارە کلاسیکییەت لێرەشدا پیرۆزییە خۆی هەر هەیە.

٣- زاراوە زمانی دەقی گەلۆی، موکرییە، بەڵام لە هێندێك شوێناندا لەبەر هۆیەکانی پێویستیان و جوانکاریان، کەمێکی وشەی کوردیی دوورە دەقـەری موکریـان، هێندراوەتـە نێـو وشـەگەلی دەقەکـەی و دیـارە، وەکـو وشـەی (ئـەنگۆ)ی هـەولێریێ و دەوروبـەری، کە باشـی هاوزمـان و دۆسـتییەکی گرنگـی ڕەسـەن و زمـانی لـە یەکـدی گەیشتنێیە.

٤- وشەی (دە)ی پێشگری هێندێك وشان: بە بۆچوونی من ئەم وشە زیادەیـە و تـەنیا لـە شـێوەزاری موکریانیشـدا دەگوترێـت، وەکـو وشـەکانی "دە نیوەشـەوێدا، دەگەڵـە تۆمـە، خـەمی دە تـازەم گـەلێك زۆرن و...". لێـرەدا ئـەم پێشـگرە لـە نموونـەی یەکـەم و دووەمـدا، لەباتی وشەی (لە)ی ئامرازی پەیوەندی بەکار هاتووە و لە نموونەی سێیەمیشدا لە باتی (هـی) ئامرازی هـەیی بەکار هاتووە. جا لەبەر ئەوەی گۆینـدە دەتوانـێ بە گوێرەی شوێن و زاراوەی زمـانی خـۆی چۆنی بۆ بگوترێ، بەو جۆرەی کەڵکی لێ وەربگیرێت.

٥- سـەروای (یـە)، وەکـو لـە وشـە سـەروایەکانی (بیزایـە، سـەفایە، لەیلایـە و ...)دا هـاتووە و چـەند گەلۆبێـژێك بـە جـۆری دروسـتە موکریانەکـەی بـەکاری دەهێنـنن وەکـو وشـەکانی (بیزایـێ،

سەفایێ، لەیلایێ...) ئەمن پێم وایە ئەم جۆرەیان ڕاستتر و دروستترە و فۆلکلۆریتر و کوردانەترە، لە جۆرەکەی دیکە.

٦- سەرجەمی بابەتەکەی، وەکو دەق، درێژە و بە گوێرەی جۆری سەروایەکانیشی، چوار کۆپلەی تەواوە و، گوتنێ هەر چوار کۆپلەکانیش بە یەك ئاواز و لە یەك کاتدا پێکەوە، ڕەنگبێ گەلۆبێژێك نەتوانێ بە یەکجار هەر هەموو دەقەکەی بە ئاواز بە یەکەوە بڵێ، جا لەبەر ئەو هۆیەی، ئەگەر کەسێك بیەوێ هەمووی بە گۆرانی بڵێ، پێویستە بە چەند جارێکان و بە کاتی جودا تەواوی بکات و بیانخاتە سەر یەکدی، یان هەر وەکو گوتراوە، دەکرێ هەر بەمجۆرەی کۆپلەبڕێرییەی لێ بکات، بەڵام ئەگەر گەلۆبێژێکی لێزان و دەنگخۆش، بتوانێت هەمووی بەسەر یەکدییەوە بچڕێت، بێگومان بابەتەکە لە نەمان و لە پچڕپچڕیە دەپارێزێ و دەمێنێتەوە و دەبێتە هۆی دەقێکی سەرچاوەیی.

٧- سەرجەمی دەقی گەلۆی، لە نێو هونەری ڕەسەندا، لە جوانترینەکانی ئاکار و باش و جوانەکانە، سەرچاوەکەشی وەکو دروست دەگەڕێتەوە بۆ فەرموودەی بەرزی یەزدانی کە دەفەرموێ: "خودا جوانە و جوانییەتی خۆش دەوێ".

لێرەدا پێویستە ئەوە بزانین، کە وشەی جوانی، وشەیەکی گشتیی هەمەلایەنە بۆ سەرجەمی لایەنەکانی جوانییەتییە بەرچاوان، وەکو: ڕەوشتی باش، کاری چاك، بۆچوونی بەکەڵك، مرۆڤدۆستی، خۆشەویستی و...هتد.

## دادگایی کردنێ نێوانێ گوڵان و خاڵی شیرن لەیلایێ:

لەوێ ڕۆژێوە، کە مرۆڤ هاتوونە سەر ڕووی زەوییە و لە تاکەوە بوون بە جووت و لە جووتیشەوە بەرەو زۆربوون و زۆربوونتر پەرەیان گرتووە، دیارە هەتا ئێستێشی لەگەڵدابێ، کێشەی نێوان مرۆڤ و مرۆڤان خۆ بە خۆ لە لایەکییەوە و، کێشەی نێوانێ بوونەوەری دیکە و دیکەش بە نەهێنی و ئاشکرایی، هەر هەبوو، بەڵام بە گوێرەی کات و ڕێژەیی لە زۆران زۆر و لە کەمانیش کەمتر، چونکە ئەگەر میری مەزن، مرۆڤ و هەر بوونەورەێکی دیکەی ئەفرۆداندووە، گەلێکی ئاکاری زێدەباش و جوانیش پێ بەخشیون، بەڵام دەکرێ بگوترێ، بۆ نەپسانەوێ و پێشکەوتنی ژیانێ و بۆ ڕکەبەرییە، لە کاتی ئەفرۆداندنێدا، کەمێکی تۆوی دووبەرەکییە و ئێرەییەی لەگەڵ قوڕ و کەرەستەکانی دروستکردنێدا، تێکهەڵشێلابێ!

جا بێگومان لە نێو مرۆڤی ئافەریدەکراویشدا، کەسانی هۆشیار بۆ چارەسەرێیان و دادوەریکردنێ، وەکو خەڵکی کۆمەڵایەتی، هەمیشە هەبوون و ڕێزیشیان لێ گیراوە. دیارە ئەم کەسایەتییە ڕۆشنبیرانەش، بە دادوەرەکانیشیانەوە، بریتی بوون لە مەلای مزگەوتەکان و کەسانێکی دیکەی خوێندەوار، کە پێیان دەگوترا (میرزا)، کە ئەوانیش هەر بەرهەمی مەلایەکان بوون. بێگومان ئەم کێشانەش لە نێو کۆمەڵگایدا، هەمیشەیی و بێ کۆتایی بوون و هەر هەشبوون، چونکە سروشتی مرۆڤان لەسەر ئەم بنەمایەی ئافەریدە کراوە، هەر وەکو دەفەرموێ "مرۆڤ بە شێوەی پەلەکردن ئافەریدە کراوە".

ئاشـكرایە ئەگـەر كێشــەی ئێرەشمـان كێشـێكی لەمێژینەیـە، بـەڵام كێشەی نێوانێ مرۆڤ و مرۆڤان نییە، بەڵكو كێشەی نێوانێ جوانترینی دەستەی ڕووەكان و مرۆڤێ مێیینەیە و، گەلێكیش كێشێكی ئاڵۆزە.

بەلای زۆر بیرمەندانەوە، مرۆڤی مێیینە بە گوڵ دەچوێندرێ، بەڵام بە لای هێندێكانیشەوە بە پێچەوانەوەیە، دیارە ئەگەر شاعیرانیش لەم ڕووەیـەوە، شیعرسـتانێكی زەنـوێر وڕازاوەیـان پێكهێنـاوە. ئێمـەش لـەبری هـەموو ئـەو شـاعیرە خـاوەن بـیری تـیژ و پەسـەند و ڕەسـەنانە، چـەند شـاعیرێك و شـیعرەكانیان دەكەینـە نموونـە و دەیانخەینـە سـەر مێزی لێكدانەوان و بۆچوونان و نمایشیان دەكەین، هەر وەكو دەڵێن:

گوڵ چون ڕووی ئازیز نەزاكەت پۆشان
وەفراوان چون سەیل دیدەی من جۆشان[1]

گوتم بلبل بە دینی خۆت گوڵت پێ چاكە یا كوڵمی؟
بە بانگی ئاشكرا بلبل دوو سەد تەعنەی لە شەشپەڕ دا[2]

چۆن مەحكەمەیی عەشق نەدا حەق بە جەماڵت؟
خەندەیی لەبێ مەعسوومە ئیفاداتی گەواهت!
وەك بلبلەكەی فەجری ئەزەل وێردمە ئەی یار:
بۆ ئەو گوڵە خەڵقی ئەكا حەمدی ئیلاهت![3]

---

١- دیوانی مەولەوی، سەرچاوەی پێشوو.

٢- دیوانی قانیع، ژیان و شیعرەكانی، كۆكردنـەوە و ئامـادەكردنی بورهـان قانیع، چاپی یەكەم، چ(زانكۆی سلێمانی)، ١٩٧٩.

٣- دیوانی گۆران، سەرچاوەی پێشوو.

گـــەلۆ، بـــە گـــوێرەی دانـــەری پەخشـــانە شـــیعری گـــەلۆی و گەلۆبێژەکانمان، کە بێجگە لەوانیش هیچ سەرچاوێکی دیکەمان نییە، کەسـی دادوەر (مـەلا، شـەماڵ، شـیبا)، لـەم کێشـەی نێوانـێ مـرۆڤ و گوڵاندا دەبیندرێن، بەڵام ئەوەی لـە هـەموو دەقەکانـدا دیارە، دادوەری یەکـەم، کـە مامۆسـتای مەلایـە، کێشـەکەی ڕەت دەکاتـەوە و نایبینـێ، بێگومان هەر وەکو مەلای گوندیش ئەم دادوەرییە ئیشـی خـۆی بـووە، کـە کێشـەکەی، یـەکلایی بکاتـەوە، بـەڵام چارە چییە؟! ئەوە مەلایـە و خەریکی کارێکی دیکەیە و ئەم کارەیان ناکات.

دیـارە هـەر دەم و دەسـتیش، زیرەکانـە و مەلایانـە، زۆر بـە ڕێـزەوە ڕەوانـەی دادوەرێکـی دیکـەی کـردوون، کـە ئـەویش (بـا)ی هێـدی و هێـواش و بـە ئـارامی (شـەماڵ)یە. هێنـدێك لـە دەقـەکانیش، ئامـاژەی بـەوەی دەکـەن، ئەگـەر کێشـەکەی یـەکلایی کردووەتـەوە و کۆتـایی پێهێناوە، بەڵام بە بۆچوونی خۆم، ئەم یەکلایکردنەوەی دادوەرییەی ڕاسـت نییـە، زۆرترینـێ دەقـەکان کێشـەکەی بـە دادوەری سـێیەم یەکلایی دەکەنەوە، کە ئەو دادوەرەش بای شیبایە، دیارە ئەم بایەش، بایەکی نـەرم و میانـەڕەوە و، فێنکـە و، بـای دوای نیوەشـەوانی دەمـەو بەیانییانـە و کـەمێکی شـێی مەیلـەو تـەڕایی و سـاردایییەی هەیـە، ئەمـەش بە ڕێـژە و بـە گوێرەی چۆنییەتییە بایـەکانی دیکـە و وەرزی سـاڵێ و دەڤـەرەکانی گـەرمێن و کوێسـتانان، فێنکـی و ساردییەکەی، گۆڕانی بەسەردا دێت.

ڕوون و دیارە ئەگـەر وشـەی بـای (شـیبا)یە، لـە وشـەی (شێبا)یەوە هاتووە، چونکە (شێبا) لەگـەڵ کاتەکەیـدا بابەتییانـە و گونجـاوترە، لـە لایەکی دیکەشـەوە وێدەچێ ئـەم گۆڕینـە لەبـەر جوداکردنـەوێ وشـەی

(شێ)ی ڕەنگەوە، لەگەڵ وشەی (شێ)ی کەمە تەڕاییەوە دروست بووبێ، چونکە ڕەنگی (شێ)، ڕەنگێکە لە نێوانێ سووری و سپییەدایە و وەکو زەردێنەی هێلکەی دەچێت و لە ڕەنگی یاڵ و کلك و بەلەکانی ئەسپ و مایناندا خۆی دەنوێنێ و، ڕەنگی ولاخەکەی پێ لە ڕەنگی دیکە جودا دەکرێتەوە، وەکو: (ماینە کوێت، ماینە شێ)، دیارە کە وشەی شیبا، بەکارهێندراوی وشەی شێبایە و پەرەی گرتووە و بڵاو بۆتەوە.

لە نێو شیعری شاعیرانی زووتردا وشەی (سەبا) پتر لە وشەی شیبایە بەکار هاتووە، لە زمانی عارەبانیشدا، بە وشەی سەبایە دەگوترێ (صبا) یان نەسیم.

گەلۆدۆستینە، بۆ یەکلاییکردنەوێ دادوەرییە کێشەکەی نێوانێ گوڵان و خاڵی شێرن لەیلایێ، ئەمن بە بۆچوونی خۆم، شیبای دادوەری سێیەم، بە ڕاستتر دەزانم لە دوو دادوەرەکەی دیکەی.

(شیبا)ی نێو ئاوازە فۆلکلۆرییەکان و (سەبا)ی نێو هەناوی شیعرزاری شاعیرانی کلاسیك، وەکو نەرمەبایەکی هێواشی فێنکی سپێدەی پێش زەردەی سەران نەدیتوی هاوینان و هەوەڵەپاییزان، زێدە خۆش لە بەدەنان خۆشە و، لە نێو تەخت و چیخی سەربانان، شەوان ئەگریجە و پەرچەمی جوانان باوەشێن دەکات و ئارەقێ سەر کوڵمان هەڵدەفڕێنێ و، گەردن و بەرگەردنان فێنك دەکاتەوە! بەم بۆنەشەوە بە ڕەوای خۆی دەزانم، ئەگەر شیعرستانێکی ڕازاوە پێشکێشی بابەتەکەی (شیبا و شێبا) و (سەبا)ی کوردێندراو، بکەینە دیاری و بەرابەریان، وەك لکە شۆڕەبییان بە بای بەیانییان، جوانویستانە بەژن و سەری خۆمان ڕاژێنین...:

سەبا یارانی مەجلیس گەر هەواڵی من دەپرسن لێت؟
بڵێ کێشاویە مەیخانە، دوو چاوی بێچووە عەیاریّ[1]

خەندەیی نەفەسی تۆ بوو، وەکو سوبح و نەسیمی
یا گوڵ دەمی پشکوتن و، عەتری وەرەقی بوو[2]

جانم فیدایی سروەکەت ئەی بادەکەی سەحەر
ئەی پەیکی موستەعید لە هەموو ڕاهی پڕ خەتەر[3]

پەیامی من بە گوێی ئەو دولبەرە ڕاناگا
نەسیم بێ سیم دەبینێ، بەم کارە ڕاناگا[4]

لە نێو گوڵزاری ئەم شیعرستانە قەشەنگەیدا، وشەکانی (سەبا، نەسیم، سروە)، هەموویان بە مانای بای هێمن و لەسەرخۆی بەیانییان دێن، کە ئەو بایەش، بای شێبای شیبایە.

لێرەدا، لەبەر ئەوەی ئەم شیعرستانە زەنوێرە ڕازاوەمان وەکو دیمەن و وێنە هێنایە بەر تێنۆڕینی ڕوونکردنەوێ چاوان، بۆمان دەسەلمێندرێ، کە دادوەری دروستی یەکلاییکردنەوێ ئەم دادگاییکردنەی، شیبای ئارامبەخش و فێنك نەبێ، بێگومان هیچ دادوەرێکی دیکە نەیتوانیوە خۆی لەو کێشە ئاڵۆزە دێرینزادە بە ڕەگ

---

١- دیوانی شێخ ڕەزای تاڵەبانی، سەرچاوەی پێشوو.

٢- دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو.

٣- دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو.

٤- تاریك و ڕوون، گوڵبژێرێك لە شیعرەکانی هێمن موکریانی، بنکەی پێشەوا، چاپی یەکەم، ناوی شوێن و چاپخانە نەنووسراوە، ١٩٧٤.

و ڕیشە داکوتراوە بڵاوەی بدات و، بە سەربەرزانە و دروستانەش بە ئەنجامی بگەیەنێ و هەردوو لا بەربەرەکانیش، بە کامی دڵ پێی دڵخۆش و ڕازی بن.

جا، بۆ بەڵگەی ئەم دادگاییکردنەش، بنۆڕنە مەلا ساڵحی زێوێی، داخۆ لەم ڕووەیەوە دەڵێ چی؟

چاوەکەم ئەمڕۆ لە گوڵشەن، گوڵ بە عیشوە خۆی نواند
نەك نمەککیر بم، بە مەرگی تۆ قەسەم هیچ نەمدواند
گوڵ بە تۆزی پێتەوە لاف و گەزافی لێ ئەدا،
وا شوکر سۆسەی نەسیمت هات ئەویشی لێ ستاند
با وجود ئینساف بدەم چاکە گوڵیش موشتاقتە،
هەر لە شەوقی تۆیە سەرپۆش و گریبانی دڕاند[1]!

گەلۆییانی برادەری چاکویست و جوانپەرست، ئەمن پێم وایە بۆ سەلماندنێ دادپەروەرییەکەی دادوەر (شیبا)یە، وێدەچێ ئەگەر ئەم چەند بەڵگانەی سەرێ، یەکلاییکەرەوە بن...

---

١- مێژووی ئەدەبی کوردی، سەرچاوەی پێشوو.

# دانەری گەلۆی باسەکەمان

گەلۆ، پەخشانە شیعری بابەتەکەمان، بە وشە و ئاوازەوە پارچە فۆلکلۆرێکی زێدە بەنرخی ڕەسەنی وێژەی کوردییە و لە نێو ئەستێرەجاڕی ئاسمانێ پاك و سامانی ئەدەبی کوردیدا، ئاوازێکە وەکو ئەستێرەی گەلاوێژێ تاریکە شەوی گەش و گرشەدار و ڕووناکیدەر و سەرنجڕاکێش و دیارە.

ئەم گەوهەرە یەکدانە پاك و پوختە، وەکو خاوەنی تایبەتی، ناوی هیچ کەسێکی لەسەر نییە، بەڵام بە گوێرەی وشە تەمەن و دێرینەکانی و ساڵ بەسەربردەییەکەی، وەدەردەکەوێ ئەگەر کەمێك تەمەندارە، بەڵام بە بابەت و دیمەن و نێوەڕۆك، گەنجێکی باڵا بڵند و شێکپۆش و کەم دیار و فۆلکلۆرییە و، کەسانی گەلۆویست و جوانپەرست و بابەتناس، لەبەر ڕەسەنیانی و نازداریانی، نەوە لە دوای نەوە لە یەکدییەوە وەریانگرتووە و فێری بوون و، بە خۆشییەوە گوتوویانەتەوە و کۆڕ و دانیشتنەکانی خۆیانیان پێ گوزەراندوون و، بۆ ئارەزوێ دڵی خۆشیان، زۆر جاران و دەما و دەم چڕیویانە و درێژەیان بە تەمەنێی داوە و نەیانهێشتووە تەپ و تۆزی لەبیرچوونەوێ و بزربوورییانی لەسەر بنیشێ.

جا، لەبەر ئەوەندە خزمەتەی ئەگەر کراویەتی، لەو ڕۆژەیەوە ئەگەر لە داکێی بەربۆتەوە و گەیوەتە تەمەنێ گەنجیانی، هەتا ئێستێش، هەر گەنجە و گوێی لێ ڕادەگیرێ و چێژی خۆشیانی لێ وەردەگیرێ و سەری فەرامۆشیانی بۆ ڕادەژێندرێ و خەمی کۆن و نوێی نێو دڵانی پێ

پەراگەندە دەکرێن و لە کۆتایی چڕینێشدا، دروودی دروست و پڕ بەدڵ بۆ داك و بابی گەلۆبێژی ڕەوانە دەکرێن: ئەی ڕەحمەت لە داك و بابانت!

دڵنیام ئەگەر لەویٚ ڕۆژێوە ئەم دەقە گەلۆیە داندراوە و گوتراوە، رووپەڕی سەر کاغەزانی نەدیوە[1]، بەڵکو هەر بە شێوەی لە یەکدی وەرگرتنێوە و بە بەرەڵایی و بەربڵاوی ماوەتەوە و پارێزراوە، واتا هەر بۆ خۆی بە هۆی وشەی ڕەسەن و، کاریگەرییە ئاوازی خۆش و، ویستراوی سەر دەروونیٚ خەڵکی، بووەتە هۆی پاراستنی مانەویٚ خۆی.

کاتێکیش ئەگەر نەوار پەیدا بوون، لەملاولایان کەسانێکی خۆ بە لێپرسراوزان و دەروەست لە پاراستنیٚ سامانی نەتەوەیی، بۆ فێنکایەتییە دڵی خۆیان و خۆشەویستان، لەگەڵ گەلۆبێژانی دەنگخۆشدا، تۆماریان کردووە و بڵاویان کردووەتەوە، جا هەر چۆنێك بیٚ، لە نەبوونیٚ چاکترە.

دارشتنیٚ وشە و دەستەواژە و ڕستەکانی بابەتی نێوەرۆکی فۆرمی مەقامی گەلۆی، نە بە شێوەی شیعری کلاسیکی کوردی و، نە وەکو پەخشان دارێژراوە، بەڵکو دارێژراوێکە لە نێوانی هەردووکیاندایە، کە

---

١- بە پێچەوانەوە، ئارارات ئەحمەد لە دوو شوێندا: یەکەم/ گۆڤاری (ڕوانین- ژمارە ٧ و ٨) کە گۆڤارێکی ڕووناکبیری گشتی بوو و لە ڕانیە دەردەچوو، دووەم/ لە کتێبی قوتووی عەتار- قوتووی یەکەم دا، دەقی گەلۆ و باسێکی لەمەڕ گەلۆ، بڵاو کردۆتەوە. وە دیسا هەر لە بەرگی یەکەمی قوتووی عەتاردا دیدارێکی درێژی لەگەڵ هونەرمەندی میللی (ڕەسووی نادری)دا، سازداوە و بە تێری باسی لە گەلۆی کردووە. لەگەڵ ئەوەشدا کە ئارارت ئەحمەد بە هۆی نزیکی و ئاشنایەتیی زۆری لەگەڵ مامۆستا زیادی نووسەری ئەم کتێبەدا، زۆر بەتین بووە، هەر سێك بەرگی قوتووی عەتاری خۆی پێشکەش کردووە, بەڵام بە داخەوە کە ڕەنگە بیری نەمابیٚ کە دەقی گەلۆ لەو کتێبەدا بڵاوکراوەتەوە. (ئنستیتیوت)

لـە سـەردەمی ئێسـتێدا پێـی دەگـوترێ (پەخشـانە شـیعر)، ئەمـەش بـە واتای ئەوە دێ، کە دەقەکە ڕستەی سەرواداری هەڵوێستی هەیـە، بەڵام لـە بـارەی کێشـەوە، وشـە و ڕسـتەی بڕگـەزۆر و بڕگەکـەمی هەیـە و تـەرازووی کێشـی بڕگـەیی ڕسـتەکانی لـە بەرابـەری یەکدیـدا بڵنـدی و نەویـەتییان پێـوە زەق و دیـارە. گەلۆیەکـەمان ڕسـتەکانی بـەهێزن و بابـەتی ڕەوانبێـژیی زۆریـان تێدا بـەدی دەکـرێ، بەتایبـەتی دەربـارەی جۆرەکانی لە یەکدی چواندنێوە، زۆر ئاماژە بە ڕووداوی گرنگی بابـەتی فۆلکلۆری دەکات و بەسەرهات و داستانی ڕابوردووی تێدا دەبیندرێ.

لە نێو وشەگەلی گەلۆیدا، کۆمەڵێکی وشەی بۆ لـە یەکدی چواندنێ تێدا هاتوون، کە چەندێك ئەندامی جەستەی ئافرەتان و و ئاکاریـان بـە شـوێن و ڕووداوی مێـژوویی چـوێندراون، ئەوانـەش، وەکـو سـینەی کیـژە خۆشەویستەکەی دانـەری گەلۆیەکـەمان، بە تـەختی سولەیمان پێغەمبەری ئەو سەردەم و کاتەی. یان قوڵکەی بەر گەردنێ، بە حـەوزە ئاوەکەی کەوسەرێ لە بەهەشتێ دواڕژێدا، یان شکاندنی جوانییەتییە گـوڵ و گـوڵاڵان، بـە گوڵـە جوانەکـەی بـاخی شەددادیشـەوە، بـە جوانییەتییـــە خاڵـــە ســـەر ڕوومـــەتێ کیـــژە سەرنجڕاکێشـــە هەستبزوێنەکەی ئافەریدەی هەست و دەستی یەزدانی مـەزن، کـە ئـەو کیـژەش ماشـوقەی خۆشەویسـتی دانـەری پەخشـانە شـیعری بابـەتی زێدە بەنرخی گەلۆیەکەمان بووە.

لێرەدا دەردەکـەوێ، ئەگـەر بـە وشـە و ئـاوازەوە، هەڵقوڵاوی نـاخی ئاشـقێکی نێرینـە بـووە بـۆ مرۆڤێکـی دیکـەی مێیینـەی ئافەریـدەی دەسـتکاری دەسـتی وەسـتای پـەروەردگاری مـەزنی بـێ سـەرەتا و کۆتایی.

لە سەرجەمی پەخشانە شیعری گەلۆیدا، ڕوون و ئاشکرا دیارە، ئەگەر دانەری ئەم بابەتەی، کەسێکی زۆر ئایینداری و خودایی و یەزدان پەروەر بووە و لە ئەشقی دروستی یەزدانێدا، تواوەتەوە و لە هەموو جوانییەکی سروشتی و مرۆیی و هەبوونیدا و، لە سەرجەمی شوێن و کاتانیشدا، خودا و مەزنییەتی و توانایەکەی لە یاد نەکردووە.

گەلی دۆستان، بە ڕۆچوونە نێو ئەم شیعرە چوارینەی بابا تاهیری عوریاندا، ئەشق و کەسایەتییە مەلای دانەری گەلۆم، دێتە بەر چاوان و نێو بیر و هۆشان، کە بابا تاهیر لە بارەی ئەشقی دروستی خوداییدا دەڵێ:

"... ڕوو بکەمە سەحرا وێنەت دەبینم
بچمە نێو دەریا شێوەت دەبینم
ڕوو لە هەر جێ کەم، چیا و دەر و دەشت
وێنەی بێ وێنەی تۆی تیا ئەبینم[1]..."

خوێنەری خۆشەویست، بە بۆنەی ئەم جۆرە بۆچوونانەوە، بە باشی دەزانم کە بۆچوونی خۆم و خزمێکتان بۆ بگێڕمەوە، کە لە شێوەی ئەم دەستکردە جوانانەی میری مەزنە:

ڕۆژێکی، لە بازاڕی قەڵادزێ، لە دوکانێ مەلا عەولای سۆفیانی پێکەوە دانیشتبووین، لەو کاتەشدا، کە هەردووکمان بێدەنگ بووین، دوو ئافرەتی مینیژۆپ لەبەری قۆڵڕووت، بە جادەی سەرەکی بە پێش مەدا هاتن و ڕۆیشتن، ئەمەش هەردووکمان هەتا تێپەڕین، بە باشی تەماشامان کردن، لە دواییدا ئەمن بە مامۆستام گوت: باشە، ئەمن

---

١- بەشێك لە چوارینەکانی بابەتایەری هەمەدانی، گۆڕینی لە لووڕییەوە بۆ سۆرانی دڵزار ئەحمەد مستەفا محەمەد، چاپی یەکەم: چ(وەفا)، بەغدا، ١٩٦٠.

کەسێکی زۆر ئایینی نیم، بەڵام خۆ ئەتۆ کەسێکی زێدە ئایینی و زێدە مەلاشی، بۆچی ئەتۆش هەر وەکو من تەماشای ئەو دوو ئافرەتانەت کرد؟! مامۆستاش هەر وەکو ئەوەی ئەگەر بیزانیبێ ئەم پرسیارەی لێ دەکەم، وەڵامەکەی ئامادە کردبوو، بە زەردەخەنەوە گوتی: ئەتۆ هەنیا تەماشای جوانییە لەش و لەرەی ئافرەتەکانت کردووە! بەڵام ئەمن تەماشای جوانییەتییە دەستکردی یەزدانی گەورەی گەورانم کردووە!

ئەمنیش گوتم بە هەر مەبەستێکەوە تەماشات کردبن هەر تەماشاکردنە و بە یاسای ئیسلام حەرامە! بەڕێزی گوتی: ئەتۆ نەتبیستووە، کە لەم ڕووەیەوە شێخی سەعدی فەرموویەتی:

کێ گوتوویەتی تەماشاکردنێ جوانان حەرامە،

حەرامە هەر کەس تەماشای ڕووی جوانان نەکا!

واتا کێ گوتویەتی تەماشاکردنێ جوانان حەرامە؟ ئەم بۆچوونە هەڵەیە و ڕاست نییە، بەڵکو تەماشا نەکردنیان گوناهە!

هەر لەم ڕووەشەوە ئەحمەد هەردی شاعیر، گیرۆدەی جۆرێك لەم بیر و بۆچوونەی توانەوەی چەشنە ئەشقێکی مرۆڤی مێیینە بووە، کە لە کتێبی شیعریی (ڕازی تەنیایی)دا، هەستی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

سەرنجی ڕێ ئەدەم ڕێگا، هەموو شێوەی ئەوی تیایە
وەکو دنیا لە ناو جوانیی ئەوا توابێتەوە، وایە[1]

---

١- ڕازی تەنیایی، ئەحمەد هەردی، چ(زانکۆی سەلاحەدین)، هەولێر، ١٩٨٤.

بێگومانم لەوەی کە بیر و بۆچوون و هێنانەوی وشە و گوتە و بابەتی زۆری فۆلکلۆری قەشەنگی وەکو ئەم جۆرە کارانە، لە کاری کەسێکی خوێنـدەواری گـەلێك تێگەیشـتووی پێگەیشـتوودا نـەبێ، کەسـێکی دیکەدا نییە! بە ئاشکراش دیارە ئەگەر خوێندەواری ئەو سەردەمەی، لە کەسانی پێشڕەوی ئایینی بەو لاوە، کەسانی دیکە لەو ڕووەیەوە بوونیان نەبووە، جا لەبەر ئەوەی لەو باوەڕەیدام ئەگەر دانەری ئەم پەخشانە شیعرەی خۆمان، مەلایەکی زانای ئاشقی دروستی یەزدانی خۆی بووە، زۆریش وێدەچێ ئەگەر بیر دەربڕین و کردنی بە وشەی کڵپەداری ئەم ئەشقە دەروێشییەی مەلای دانەری فۆڕمی گەلۆیەکەمان، لە زانست و ئەدەبیاتی نالی و سالم و مەحوی و وەفایی کەمتر نەبووە، بەڵام ڕەنگبێ دانەر بۆی نەلوابێ ئەگەر خۆی بۆ شیعر تەرخان بکا، یان ئەم جۆرە داڕشتنەی لە کن پەسندتر و ئاسانتر بووبێ و خۆی لە کێش و بڕگە و سەروایان ڕزگار و ئازاد کردبێ.

لە گوینە ئەگەر لەم جۆرە بابەتانە گەلێك پتر هەبووبن، بەڵام لەبەر نەنووسـراوی و تۆمـار نـەکراوییان تێداچـووبن، یـان کاریـان لەسـەر کراوە و بە هۆی باری سیاسی و شەڕ و ئاڵۆزی و بڵۆزییە وڵاتی پڕ لە کێشەدا تێداچووبن، هەر وەکو زۆر بابەتی دیکەی ئەم چەند ساڵەی کوردستانێ باشووری پڕ لە کێشە و ئاژاوە. دەشگونجێ ئەگەر زۆر بابەتی دیکەی وەك پەخشانە شیعری گەلۆی، لە نەمانێیان ڕزگار بووبێ و مابن، بەڵام لە پەنایان دیار نەبن و وە بن تۆز و لیتەی ڕۆژگارێ لەمێژینە کەوتبن و لەملاولایاندا بە شێوەی کەمکەمۆکە و پچڕ پچڕ و پارچەی لە یەکدی دوور و بزر جار جارە ڕێکەوت وەدەریانبێخێ و بە کۆششێ دڵسۆزانیش، خاوێن بکرێنەوە و بە

ڕازاوەیی بگێڕدرێن و ئێمەش شانازییان بە بەرهەمی باب و باپیرانمانەوە بکەین، لەم بارەشەوە حاجی قادری شاعیر ئامۆژگاریی کردووین و پێی گوتووین:

ئەم فەسیحانە پاکی بۆ ناون
باعیسی پێت بڵێم نەنووسراون![1]

یان لە شیعری (ئەگەر کوردێك قسەی بابی نەزانی)دا دەڵی:

کتێب و دەفتەر و تەئریخ و کاغەز
بە کوردی گەر بنووسرابا زوبانی
مەلا و شێخ و میر و گەدامان
هەتا مەحشەر دەما ناوونیشانی[2]

---

١- دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەرچاوەی پێشوو.

٢- دیوانی حاجی قادری کۆیی، سەرچاوەی پێشوو.

## بۆچوونێ وەکو یەکدی لە نێوانێ بابەتەکانمان و شیعری کلاسیکدا

دروستە ئەگەر بگوترێ بۆچوونی لە یەکدی جودا لە بارەی هەر بابەتێکی تایبەت بە کەسێکی، بێ ئاگاداربوونێ بۆچوونێ کەسەکانی دیکەی دەڤەرەکانی دوور، یان نزیک لە یەکدی، کەم و زۆر بۆچوونی جۆراوجۆری بەیەکداچوو، هەر دەبن. بۆ نموونە وەکو ئەگەر نووسەرێك لە کاتی نووسینێکدا کارەبای لێ دەکوژێتەوە و کاری نووسینەکەی لێ تێك دەچێ و زنجیرەی بۆ چوونەکانی دەپچڕێ، جا لەبەر ئەو بێ ڕووناکییەی، پەخشانێك، یان شیعرێکی لەسەر گەورەییە تۆماس ئەدیسۆنی داهێنەری کارەبای، دەنووسێ، زۆر گونجاوە ئەگەر لە وڵاتێکی دیکەی دووریش، نووسەرێك هەر لەسەر ئەو مەزنە مرۆڤەی، بابەتێکی بنووسێ، دیارە بۆچوونەکانی هەردووکانیان، ئەگەر وەکو یەکدی نەبن، بێگومان زۆر لە یەکدی دەچن، هەتا ڕاددێکی ڕەنگبێ بۆچوون هەبن بڵێن، ئەو دوو بابەتە لە یەکدییەوە وەرگیراون.

لەبەر ئەوەی شیعری کوردی شاعیرانی کلاسیك، گەلێك ڕەگەزی وەکو یەکدی، بۆچوونی هەر بابەتێکی تایبەت لە سەرجەمی تێکڕای باسەکاندا، دیار و پەیوەندیدارن بە یەکدییەوە. جا لەبەر ئەو پەیوەندی و لێچوو و لەوچووەیدا، بە پێویستم زانی ئەم شیعرەی مەلا سالحی زێوێی (حەریق)، بکەم بە نموونەی هەموو ئەو

شاعیرانەی، کە لە شیعرەکانیاندا ئەم ڕەگەز و بنەمایانەیان تێدا دەدرەوشێتەوە و بۆچوون نزیکی، وەدەردەکەون.

ئەوەی لە تێکڕای بابەتەکانی باسەکەماندا و لە نێو شیعری شاعیرە بەرزە کلاسیکییەکاندا، وەدەردەکەوێ و دەبیندرێ ئەوەیە، کە لە بەراوردکردنێ هەر ئەندامێکی جوانی مرۆڤی مێیینەدا، لەگەڵ هاوشێوەیەکی جوانی سروشتێدا، سەرکەوتنێ ئەندامە مرۆڤییەکەی، بالآتر نیشان دراوە، هەر وەکو لە لێکچواندنی بە گۆنای کیژان و، پەڕی سوورە گوڵان بە لێوی ئاڵ.

زێوەری شاعیر، لەو ڕووەوە چاکی بۆ ڕوون کردووینەوە و ماموستایانە لێچوو و لەوچووی نیشان داوین، کە دەفەرمووێ:

تکانی ئابڕووی چەمەن، بە ڕووی ئابدارەوە
شکانی نرخی نەستەرەن[1]، بە زوڵفی موشکبارەوە[2]
چمە لە مەی؟ لە نەی! ئەگەر بە لەنجە بێتە لام
بەڕوویی ئابدارەوە، بە چاوی پڕ خومارەوە
عەرەق نییە لە عالەما، کە لابەرێ لە دڵ غەما
جگە لە قەترە عارەقێ، لە ڕووت، کە دێتە خوارەوە
نیشاطی من جەماڵی تۆ، بەراتی من ویساڵی تۆ
خەیاڵی من لە خاڵی تۆ، بە عیشوە لێم مەشارەوە

---

١- نەستەرەن: ڕووەکێکی کێوییە، ١ بۆ ٥ مەتر لە زەوی بەرز دەبێتەوە، گوڵەکانی چکۆلەن و پێنج پەڕەیان هەیە و بۆنێکی زۆر خۆشیان هەیە، ڕەنگی جۆرا و جۆری هەیە، قەد و لقەکانی دڕکاوین. (ئنستیتیوت)

٢- میشکبار: بۆنخۆش، میسك، وەك ئەوەی بۆنی میسکی لێ بارکرابێ.

**عەزیزەکەی حەبیبی من، نیگارەکەی طە بیبی من**
**کە شەق بەرێ ڕەقیبی من، وەرە بە سەد ویقارەوە**
**فیدایی خەدد و قەددی تۆ، چەمەن بە فەوجی گوڵیەوە**
**بە بولبول و بە چڵیەوە، بە قومری و هوزارەوە**
**فەڕەنگ ڕووی زەنگ موو، عەجەم سیاق و ڕووس خوو**
**ئەناسرێ کە کوردە زوو، بە پێچی لار و خوارەوە**
**نیشانی زوڵفی عەنبەری، هەموو وڵاتی (گوڵ عومەر)[1]**
**بە عەرد و بەرد و دارەوە، بە ئاوی سەرچنارەوە**
**ئەمن گەیاندمە ئەنوەری، فنونی شیعر و شاعیری**
**ئەتۆش گەیانتە (سامیری)، بە چاوی سیحرکارەوە[2]**

---

**تێبینی:**

**وەکو دیارە لە نێو پەخشانە شیعری گەلۆی ئەوانی دیکەشدا، لە یەکدی چواندن و بەرابەر بە یەکدیگرتن، هەر وەکو شیعرەکانە، بەڵام بە شێوەی نە شیعر و نەپەخشان، واتا (پەخشانەشیعر)، دیارە ئایەتەکانی نێو سووڕەتی قوڕئانیش، هەر بە هەمان شێوە داڕێژراون و نە شیعر و نە پەخشانن.**

---

١- گوڵ عومەر: گوڵ عونبەر، گوڵ عەنبەر، ناوێکی دێرینی شاری خورماڵە، کە بە هێندێ ڕای مێژوویی، لەسەر شوێنەواری شاری شارەزوور بنیات نراوە. بڕوانە: دیوانی زێوەر، ئامادەکردنی مەحموود زێوەر، چاپی دووەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، هەولێر، ٢٠٠٨. ل١٧٦. (ئنستیتیوت)

٢- دیوانی زێوەر، ل١٧٦، سەرچاوەی پێشوو.

ئـەم شـیعرەی زێـوەری شـاعیر، شـیعرێکی گـەلێك بەرزەبالآیـە، بـە تایبـەتی لـە بـارەی کۆکردنـەوەی هـەر ئەنـدامێکی جوانی بـەناوبانگی ئافرەتی هەر نەتەوێکی باسکراوی ناو شیعرەکەی، بێجگە لـە دیمەنـە دڵفرێنە جوانە سروشتییەکانی، کە وەکو لە شەوانی سامانی ساردی زسـتانێدا، تەنکـە ئـاونگێکی وردی ئاردییانـەی سـپیی بریسـکەدار، لەسەر چیمەن و نەرمە وردە گیایان دەبارێ و دەکەوێ و دەمێنێتـەوە، کـە پێـی دەگـوترێ (سـیخوار) و دەبێتـە میـوانی ژوانـێ دەسـتەملانی پەڵەی نەرمی وردە گیا و چیمەنێ، کە لە سپێدانیشدا، ئەگـەر خـۆر بۆ دیتنێ و تێڕوانینـێ دیمـەنی دەشـت و کـەژ و کێـوان، سـەری خـۆی لـە بڵندایيه سەرکەلێوە، دەکەوێتە سەراسوێکردنێ و بـە تیشـکی زێڕینـێ خۆی، دەکەوێتـە پرپشـك هاویشـتنێ و ڕووناکـایی پەخشـکردنێ، ئـەو کاتەی سیخوار و چیمەن لە شەرمێ درەنگ بێداربوونەوێ و لەبەر تانە و تەشەران و قسـە و قسـەلۆکێ بـەد و بـەدکار و ئێرەییـداران، پـەتووی بـەخۆدادانێ لەسـەر خۆیـان وەلا دەنـێن و دەکەونـە دەسـت لـە ملـی یەکدی شلکردنێ و سینە لـە سینە وەدوورخسـتنەوێ و دواماچـی بـە هیوای ژوانێکی دیکە، لە لێوی یەکدی نۆش دەکەن.

جا ئەگـەر خۆشەویستەکەی زێـوەری شـاعیر، بـە ڕوخسـاری سـپیی زیوینی و نەرمە ئارەق لەسەر بڵاوەوە، سەر لە تاقان، پەنجەران بێنێتە دەرێ و، هەنیەی هەیڤی لە چواردە و پازدان وەدەربێخـێ، چیمەنی لـە خۆبایی و گیای خۆ بە گەورەزان، خۆیان لەبەرچاوان دەکەوێ و شەرم دایاندەگرێ و سەر لەبەرخۆ دەنێن.

خۆشەویستەکەی زێوەری، نەك هەر لەبەر بەراوردێ ئەم جوانییەتییە ناسك و نازدارییانەی خۆی گرۆی[1] بردۆتەوە، بەڵکو لە بارەی بەهێزیشیەوە، بە هۆی توانا و توندی و باریك و ڕەوشی زوڵفە درێژ و بۆنخۆشەکانییەوە، نرخی داوی گرتنی باز و شەهێن و هەڵۆیانیشی دابەزاندووە.

زێوەر دەیەوێ بە ڕاوچییە باڵدارگرە بەهێزەکان بڵێ: داوەکانی گرتنێ باز و شەهێنی ئێوە، گرنگییەکەی بە هۆی دانەوەیە و تەنیاش هەر باڵدارگرە، بەڵام هەودای زوڵفی ڕەشی دوئبەری من، بە هۆی جوانی و بۆنی خۆشییەوە، دەتوانێ پاڵەوانترین و خۆڕاگرترین مرۆڤ بۆ لای خۆی بەکێش بکات و بیخاتە نێو پێچ و پەنای زوڵفی خۆیەوە و گیرۆدەی سەر لێ شیواوییە و سەرەودەرنەکردنێی بکات.

ئەوجار شاعیر خۆی هەڵدەداتە نێو دەریای پان و قوڵی خەیاڵانەوە و لەبەر خۆیەوە بە خۆی دەڵێ: ئەگەر ئەمن یارێکی ئەوەندە جوانم هەبێ و جارجارەش بە جەستەی شلك و بە چاوی بە خومارییەوە سەرم لێ بدات! ئەمن هیچ پێویستیم بە گەشت و گوزار و بە خەیاڵی مەی و گوێ لێگرتنێ دەنگ و ئاوازی گۆرانیان و زرینگەی سوڕاحی و جام و پەرداخان نییە.

لە دواتردا شاعیر ڕوو لە یارەکەی دەکا و پێی دەڵێ: ئەی یاری خۆم، ئامانجی من تەنیا بینینی ڕووی تۆیە، وەکو خزمەتکاریش، مووچە خەڵات و بەراتم هەر پێگەیشتنێ تۆیە، لەبەر ئەوەشە کە خەیاڵی من هەمیشە هەر لە دەوری خاڵی تۆیە! دە ئەتۆش ئەو

---

١-گرۆ: گرەو. (ئنستیتیوت)

چاکەیەم لەگەڵدا بکە و ئەو ویست و هیوایانەی، کە ئامانجمە، لێم مەشارەوە، چونکە ئەمن چیدیکە بەرگەی نازانت ناگرم و ئیدی بەسە و بەزەییت پێدا بێمەوە! ئەی خۆشەویستەکەی نێو دڵە خەمبارەکەم، ئەی پزیشکی سەرجەمی ئازار و دەردەکانم، جا بۆ ئەوەی ئەو کەسەی ئیرەییە بە من دەبا، کە ئەتۆ خۆشەویستی منی، جار جارە وەرە بە ڕێز و ناز و شکۆوە، سەردانێکم بکە، بەڵکو ئەو چاودێر و ناپەسندەی دەیەوێ نێوانێ ئەمن و تۆ تێك بدات، لە داخان شەق بەرێ و ئەمن و ئەتۆش لە چاودێریانی ئاسوودە بین! جا ئەگەر هاتی! ئەمن بە قوربانی چاڵی کوڵم و بالای بڵندی چیمەنی پڕ گوڵ و گوڵزارت دەبم، بە خۆم و بە باڵدارە گەورە و گچکەکانی نێو لك و چڵی درەختەکانیشەوە. ئەی یاری من، تۆ هەر ئەندامێك و ئاکارێکت، لە جوانترینی جەستەی ئافەریدەکراوی دەستی یەزدانی مەزن بژاردە کراوە و تۆیان لێ هاتۆتە بەرهەم.

شاعیر بە خۆشەویستەکەی دەڵێ: ڕوخساری تۆ لە جوانییەدا، وەکو ڕوخساری کچە فەڕەنسیان سوور و سپییە، مووەکانی زوڵف و برژانگانیشت، ئەوەندە ڕەشن، لە مووی قولە ڕەشە زەنگییەکان ڕەشترن، بەلەکی سپی و خڕ و نەرم و تورتی تۆ، لە ڕەوت و ڕۆیشتنێدا، بەلەکی کچە فارسانم دێنێتە پێش چاوان، کە لە ڕۆیشتنێدا بە لەرەی جووڵاندنێ دڵی من، وە هەراسان دێنێ و، لەگەڵ ئاکاریشت، وەکو هەڵسوکەوتی کیژە ڕووسییان، ڕێك و پێکن و لەگەڵ ڕەوتی هەنگاو هەڵێنانێدا گونجاون، جا لەبەر ئەوەی، کە جوانییەتییە هەر ئەندامێکی مرۆڤی ئەم نەتەوە لە یەکدی جودایانە، لە تۆدا

کۆبوونەوە و جەستە و ئاکاری تۆیان فەراهەم هێناوە، تۆ جوانترینی مرۆڤی مێیەوەزی دەستکردی کردگاری مەزنی.

ئەگەر هاتو لە نێو کوڕێکی جوانپەسەندی ئافرەتە جوان بژاردەکانی هەموو ئەم نەتەوانەدا، ئامادەییت هەبێ، ئەتۆ بە سەر و پێچ و جل و بەرگی کوردییەوە دەناسرێی، کە ئافرەتێکی کوردی و جوانترین ئافەریدەی دەستی پەروەردەگاری و تاجی شایانییەت پێ ڕەوا دەبیندرێ.

ئەرێ هۆ وێنەکەی هەمیشەیی نێو چوارچێوەی بینایییەکانم، تۆ نموونەی جوانییەتییە سروشتی تێکڕای کوردستانێی، بە سولەیمانییە و و ئاوە بێگەرد و خاوێنەکەی سەرچناریشەوە.

جا، خۆشەویست، ئەوە ئەمن هونەری شیعر و شاعیرییەم ڕوون کردەوە، ئەتۆش بە جوانییە خۆت بیگەیەنە ترۆپکی چیای سامیرەی، هەر وەکو چۆن خودای مەزن ڕێگای تاریکە شەوی بۆ مووسای پەیامبەری ڕوون کردەوە، بۆ بەرزی چیای سامیرەی فەلەستینێ و لەوێ کتێبی تەوراتی ڕێبەرایەتییەی پێ بەخشی!

گەلۆ، لەو لێکدانەوە و لە یەکدی چواندنە گشتییەی نێوانێ تێکڕای بابەتەکانمان، لەگەڵ سەرجەمی شیعرەکەی مامۆستا زێوەری شاعیردا، بڕواننە ئەم دوو بابەتە لە یەکدی چووە تایبەتە بەنرخانەی تاکە شیعرێکی شابەیتی نێو شیعرەکەمان، لەگەڵ دەربڕینێکی دوای هەر دانە کۆپلێکی پەخشانە شیعری مەقامی گەلۆیەکەماندا، جا ئەوجار ئەتۆش بەراورد و لێکدانەوانیان بۆ بکە و سەری ڕەزامەندییە بەرابەر جوانییان ڕابژێنە.

زێوەر فەرموویەتی:

فەرەنگ ڕوو، زەنگ موو، عەجەم سیاق و خۆش خوو
ئەناسریٚ کە کوردە، بە پێچی لار و خوارەوە

فۆلکلۆریش گوتویەتی:

ئەمن سەرگەردانم بۆ وان شەدە شلان، شل و ملان، چاو بەکلان،
گەردن زەردان، بەر کێلە بە خالآن، بەرۆك بە کلیلان،
نێو قەد بە دراوان... هاوارە گەلۆۆۆۆۆ

# هەڵەی دەما و دەمی گۆیندان لە نێو گەلۆیدا

بە گوێرەی هەبوونێ وشەی خوێندەوارانەی ئایینی ئیسلامەتییە، لە نێو دەقی پەخشانە شیعری گەلۆی باسەکەماندا، هەر وەکو گوتومانە بە ئاشکرا ئەوەمان دێتە پێش چاوان، ئەگەر دەقی ناوبراو لە لایەنی کەسێکی خوێندەواری جۆری خوێندنی خۆیەوە داندراوە، دیارە ئەگەر ئەو کەسەش کەسێکی ئایینی بڕواداری موسڵمان بووە، لەم کارەشدا دانەر هەتا توانیویەتی مێشکگوشیی کردووە و هەموو بیری تیژی خۆی بەکار هێناوە، زۆریش بە وریایی و وردەکارییەوە، پێنووسەکەی خۆی خستوەتە سەر گەڕی کاری وشەکارییە، لە نێو دەقەکەیدا، ئەمەش لەبەر ئەوەی هەتاوەکو پێویست، مافی ڕەوای بابەتەکەی، بە ئەنجام بگەیەنێ، دیارە ئەم وشە هێنان و بردنەش، وەکو گشت مانایەکی، گەلێك بە هێز و پێزی بە کۆی هەموو دەقەکەمان بەخشیوە، تام و چێژی مێ و مێخۆشەتییە و نێر و نێریەتییەی ئەوەندە بەرزەڕەوانێدا بەرجەستە کردووە، کە هەر گەنجێکی نێر و مێ، سپێدێ لە خەوێ هەڵدەستێ، ڕادەوەستێ و دەستانی بەرەو ئاسمانێ بڵند ڕادەگرێ و لە خوای دەپارێتەوە و دەڵێ: خودایە تو گەورەییە خۆت، لە شەیتانێ ببوورە!

ئەگەر کەم و پتری و کورتی و درێژیەکیش لە نێو دەقەکەیدا هەبێت، دیارە بۆ گەلۆبێژانی نەخوێندەواری زارە و زار لە یەکدی وەرگرتووەوە، دەگەڕێتەوە. ئەوەش دیارە کە بە کەمی زانستەوە لەم بارەیەوە، تووشی هەڵەی وشان و جێگە و شوێنی کۆپلە گۆڕینێ نێو

مەقامە لە یەكدی جودایەكانیش بوونەوە، هەر لەبەر ئەوەشە لە نێو دەەقەكانی گوتنیّ گەلۆبێژەكاندا، كەم و زۆری و لە یەكدی جودایی دەبیندرێن و دەبیسترێن و لە گوتنیّ بە ئاوازانیشدا گوتنبارە دەبنەوە و تەنانەت هێندێك جاران، ئاوازەكانیش لە ڕێچكەی دروستی خۆیان دەردەچن و دەكەونە لاڕیّ كردنیّ و بە هەڵە دەگوترێن و تێدەپەڕن.

لە لایەكی دیكەشەوە لە كاتی چڕینێدا جۆری ڕێكخراویەتییە سەر لەقاندنێش، لە گوێدێران دەشێوێنن و گۆمی مەندی ئەندێشەكانیان دەشڵەقێنن و لێیان شلویّ دەكەن و ڕوانیان پیّ گرژ و مۆن، وە دیار دەهێنن و جێگە و پێگەیان پیّ بەجیّ دەهێڵن!

بە كورتی وەكو هەستیاران هەستیان پێكردووە، لە ئەنجامی لە یەكدی وەرگرتنیّ كەسێكییەوە بۆ كەسێكی دیكە، گەلێك هەڵە كراون، جا لەبەر ئەوەی، پێویستە ئەو هەڵانە ڕاست بكرێنەوە، بۆ ڕەسەنە دروستەكەی خۆیان، ئەمنیش وەكو ئەركێكی نەتەوەیی، بە گوێرە و توانا و كەمە زانستە فۆلكلۆریەتییەكەم، ڕەنگبیّ وەكو خواریّ خۆشەچین لەم پەراوێزەیدا گردوكۆ وەسەر یەكدی نابیّ، ئەوەش وەكو:

١- گۆڕانكاری زەق و دیار لە وشە عەرەبیەكاندا ڕووی داوە، وەكو دەستەواژەی عەرەبی (شجرة طوبی)، كە گۆڕدراوە بۆ (شەبرە تووبا)، بێگومان ئەم دەربڕینە، دەربڕینێكی قورئانی زۆر مانادارە، بەلام گەلۆبێژەكان نە لە مانای وشەكە و نە لە مانا گشتییەكەشی، تیّ نەگەیشتوون، هەروەها لە بارەی ئەو درەختەش، كە ئەوان پێیدەڵێن (شەبرە توبا)، بیّ ئاگان، هەر لەبەر ئەو بیّ ئاگاییەش، لە بارەی ئەم درەختەوە لە شوێنێكی دیكەدا ڕووناكاییەكم خستۆتە سەریّ.

٢- تێترینجاندنێ کۆپلەی نێو دەقێکی لە نێو دەقێکی دیکەی بابەتێکی دیکەدا، کارێکی گەلێك نەشیاوی ناشییانەیە، چونکە هەر کۆپلێك و بابەتێك، تام و چێژی تایبەتیی خۆی هەیە و تێکەڵکردنیان، بابەتەکەی تێکهەڵدەشێلێ و دەیشێوێنێ و لە نرخی خۆشییەکانی کەم دەکاتەوە، هەر وەکو پێشینان گوتویانە "بەرد لە جێی خۆی بە سەنگە". لە لایەکی دیکەیشەوە ئەم کارە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێ: زمانی کوردی بۆ گۆڕینی ئاوازان، زۆر نەرم و گونجاوە، بێگومان بەم گونجاوییەشەوە لە دەقی بابەتەکەیدا هەر هەڵە و نامۆییەك پێویستی بە چارەکردنێ هەیە.

٣- دەقی مەقامە کوردییە فۆلکلۆرییەکان، درێژی و کۆپلە زۆرییان پێوە دیارە و پەخشانە شیعری گەلۆش لەم دیاردەیەی بەدەر نییە و پەخشانە شیعرێکی بە ئاوازە و گەلۆبێژانیش، وەنێو ئەم باخچە هەمەجۆر و زۆر گوڵانە کەوتوون و هەموو گەلۆبێژێکیش بە ویست و ئارەزووی خۆی گوڵبژێری جوانچنییەتییەی تێدا کردووە، چونکە بە بۆچوونی خۆی کێهە کۆپلەی پێ پەسەند بووە بۆ گوتنێ، ئەوەیانی هەڵبژاردووە، هەر لەبەر ئەوەشە، کە هیچ مەقامبێژێکی فۆلکلۆری کوردی، بە تەواوی دەقەکەی پێ نەچڕپندراوە، سەرەڕای ئەوەش پاش و پێشیان بە کۆپلەکان کردووە، ئەمنیش بە سەلیقەی خۆم ئەوەندەی ئەگەر توانیبێتم و زانیبێتم، دەقەکانم کۆکردۆتەوە و بە هۆی بەرابەر بە یەکی کردنێیان بە وشەکانیشەوە، لەجێی دروست و شیاوی خۆیانم ڕۆناونەوە.

٤- له چەند بارە بوونەوێ هەر کۆپلێکی نێو دەقەکاندا، باشترین و دروستترین و فۆلکلۆریترین و موکریترین دەقم هەڵبژاردووە بە وشەکانیشەوە.

٥- ئەو وەرزەی ئەگەر پەخشانە شیعری تێدا داندراوە، پێوەی دیارە ئەگەر کاتەکەی گۆنەڵی بەهارێکی قەشەنگ بووە، بەڵام وەکو هێندێك لە گەلۆبێژان لە گوتنەکانیاندا وشەی قۆپەنی بیزایە و هێندێکی دیکەشیان وشەی شەنگەبیزایان بەکار هێناوە، بە گوێرەی وەرزی بەهارێش شەنگەبیزای بە لك و پۆپ و گەڵا و گوڵ گونجاوترە، لە کۆلکە قۆپەنێ ئیشکەوەبووی نیوە لە گڵیدا و نیوە بە دەرەوە بووی بەر هەتاوێ هاوینێ و هەوەڵە پاییزێ، جا لەبەر ئەو هۆیەی، ئەمن وشەی (شەنگەبیزایە)م پێ دروستتر و ڕاستتر بوو، لە وشەی قۆپەنێ و هەر لە جێی خۆشی دامناوەتەوە.

٦- ئافرەتەکە لە شەوێکی نەنووستنێ منداڵەکەیدا، بە دەم لانکە ڕاژەندنێوە، لایلایەی بۆ منداڵەکەی دەکات، بە بێنووی لایلایەکەشەوە، خەمی نێو دڵی خۆی پەڕاگەندە دەکا و دەڵی: "ڕۆڵە دە بنوو، دەك ڕەبی بەبێ بابیت گەورەکەم و سەرت بۆ بابت لە قوڕێ نێی". لێرەدا دیارە ئەم ئافرەتە بە زۆری و بە نابەدڵی بە مێرد دراوە و تەنانەت منداڵەکەی خۆیشی خۆش ناوێ و بە دەم لانکە ڕاژاندنێ نیوە شەوێ نەنووستنێ منداڵەکەیەوە، توکانی لێ دەکات.

بێگومان دوعا- توکی (بەبێ بابیت گەورەکەم)، دوعایەکی گونجاوە، بەڵام دوعای (سەرت بۆ بابت لە قوڕێ نێی)، دوعایەکی نەگونجاوی نادروستە، چونکە لەگەڵ تەمەنی منداڵەکەی نایەتەوە و دەستەواژێکی زۆر درێوی هێناوەتە نێو کۆپلەکەیەوە، لە لایەکی

دیکەشـەوە ئـەم گوتـە، گـوتێکی زۆر بـازاڕی و سـواوە و بـە هـیچ بۆچوونێکی، لەگەڵ زانایی و وەستایەتییە دانەری پەخشانە شیعری گەلۆیەکەماندا نایەتەوە. جا لەبەر ئەو هۆیەی، تەنیا دوعای (بەبێ بابیت گەورەکەم)م هێشتەوە و (سەرت لە قوڕێ نێی)یەکەشم، وە لا نا، هەتا منداڵەکە گەورە دەبێ و بابی دەمرێ! جا لەبەر ئەو هۆیەی، ئەم ڕستەم فەرامۆش کرد و ئەو گوڵزارە بەزەنوێرەم لەو گیا بێوەژنە قرخنە دڕکاوییە دزێوەی، ڕزگار کرد!

٧- لە دەقێکیدا، گەلۆبێژێك دەڵێ: "قوڵکەی گەردنێت بە من بمێنێ، بە تەختی سولەیمان پێغەمبەری". دیارە ئەم جێیە بۆ تەختی سولەیمان پێغەمبەری نەگونجاوە، چونکە هیچ جۆرە لێکچواندنێکیان لە نێوانێدا دروست نابێ، زۆر لە خاڵی هاوبەشیش خاڵین، وەکو دیتومە ئەم ڕستە لە نێو مەقامی (ئازیزە)یدایە، کە دەڵێ: "قوڵکەی بەرگەردنێت بە من بمێنێ، بە حەوزی کەوسەرێ". ئەمنیش لە بەکارهێنانی هەردوو ئەم شوێنانەدا، لەگەڵ قوڵکەی بەرگەردنێ کیژە بێریان، یان هەر کیژێکی ماندووی هەر جۆرە کارێکی دیکە، کە دڵۆپە ئاوی ئارەقێی لە قوڵکەی بەرگەردنێدا کۆ ببێتەوە، لە یەکدی چواندنێکیان لە نێوانێدا دروست دەبێت، دیارە ئەم شوێنە بە هیچ جۆرێکی لەگەڵ تەختی سولەیمان پێغەمبەری ناگونجی، بەڵام بۆ حەوزی کەوسەری گونجاوترە.

٨- دەربارەی تەختی سولەیمانی، دیارە وشەی سینە، لەبارترین شوێنە بۆ ئەو مەبەستەی، هەر وەکو گەلۆبێژێك لە دەقێکیدا دەڵێ: "سینگت بە من بمێنێ، بە تەختی سولەیمان پێغەمبەری، ئەگەر بە

دیاری دەیاننــاردەوە بـۆ بەڵقیسـایێ". بێگومـان سـینە بـۆ تـەخت و، قوڵکەی بەرگەردنێش بۆ حەوز گونجاون.

٩- لـە دەقێکـی دیکـەدا هـاتووە، گەلۆبێـژێك (بـای شـەماڵی)ی بـە گەریـــدەی شـــەوان دیـــاری دەکـــات، بـــەڵام بـــای نـــاوبراو، بـــای دوانیوەڕۆیانــە، بــە شــەوانیش دەبێتــە (شــەوبا) لــە دوای درەنگــە نیوەشەوێشـدا، هـەتا درەنگـە سـپێدەی، پێـی دەگـورێ (شـیبا)، بـەڵام وشـەش وەکـو دروسـت بـە (شـێبا)ی ڕاسـتتر دەزانم لـە (شـیبا)ی بـە هەڵـەگوتراو، چـونکە ئـەم بایـە، کـەمێك فێنکـە و هـەرواش هەسـتی پێدەکرێ، ئەگەر کەمێکی شێی تەڕیە هەبێ.

گەلێ دۆست و برادەران، لەبەر ئەوەی ئەم بابەتە سامانی هونـەری نەتەوەی کوردە، بە هەڵـە مانـەوەی، ناشایسـتەیە و پێویسـتە هەڵـەکان ڕاسـت بکرێنـەوە، بۆ ئـەوەی ئـەم گـوڵزارە جـوان و زەنـویرەش وە بـن بـژارێ دڕك و داڵــی زیانبــەخش نەکــەوێ، پێویســتە بــژاری بکــەین و ئاودێرییەی بکەین و بە گەشی وەدەری بخەین.

لەم ڕووەیەوە قانیعی شاعیر دروستی گوتووە و باشی بۆ چووە، کە فەرموویەتی:

کــە دلبــەر بادەنۆشــیکا، دەبــێ مــن خزمــەتی مێوکــەم
بە شەو ئاودێری باخـان و، بـە ڕۆژ دەفعـی چڵ و چێو کـەم

# گەلۆ و گەلۆبێژان

ئەمن وەکو گۆرانی، مەقامی گەلۆم لە گەلێك گەلۆبێژان بیستووە، کە هەر هەموویان بە تێکڕایی جوانپەرستانە و ئارەزوومەندانە، ئەم ئاوازە ڕەسەنە هونەرە بەرزە کوردییەیان چڕیوە و خەمی کەڵەکەبووی نێو دڵی خۆیانیان، پێ وەدەرناون و بێرە و بەوێیاندا تەرە و ئاوارە کردوون.

خۆشی و خۆشەویستی و ڕەسەنایەتی و گونجاوییە وشە و ئاوازی گەلۆی، لەگەڵ ئارەزووی پاکی کوردانەی تاکی مرۆڤی کورد، چەندە تێکەڵ بووە، بێگومان هێندەش کاریگەریی لەسەر سەرجەمی گۆیندەی هونەرمەند هەبووە، کە هەر کەسێك لەم گۆیندانە، کەف و کوڵێ هەڵچووی نێو دڵە ئاشقەکەی پێ خامۆش کردوون و زار و زمانیشی بە وشە و ئاوازی ڕەسەن وە دەنگ هێناون.

دیارە ئەگەر کۆی دەقی گەلۆی، هەر بە هۆی نێوەڕۆکە بەپێزە دێرینە زێڕینەکەیەوە بووە، کە وە بن دار و پەردووی کەلاوە ڕوخاوێ کۆنە دنیای بێ وەفا نەکەوتووە و هەر بە گەنجی و درەوشاوەیی ماوەتەوە و، گەلۆویستە دەنگخۆشە ئاشقە جوانپەرستەکانیشی، بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە و مێزەری پێ بە تیلاکێ سەریەوە و، دەستی پێ بە بناگوێیانەوە ناون و، وە دەنگ و ئاواز گوتنێی خستوون، ئەو دەنگ و ئاوازانەش، کاروانچیی و ڕێبواری ڕێبازێی هەڵوەستە و ڕاوەستە پێکردوون و درەنگەکات و کاری بەسەر هێناون.

گەلۆ دۆستینە، ئەگەر وا ڕێکەوت کاڵە سپێدێکی بەهارێ مانگێ گوڵانێ، لە نێو سەوزاییەکی کەناری ڕووبارێکی پۆلێکی پۆڕان، بە

چریکە چریکێ خوێندنێ چریکستانێکیان پێکهێنابێ و، لە لاپاڵی نزیکە باسکێکیش، ڕەوەی کەوان ئەمبەرەوبەر بە دەنگی تەپڵ و دەهۆڵێ قاسپە قاسپێ، لە دۆڵ و دوندی سەر ڕەوەزان بە دەنگ و دەنگدانەوێ، دەڤەریان بە جۆش و خرۆش هێنابێ، هەر بە بیستنێ وشە و سەدای ئاوازی ڕەسەنی مەقامی گەلۆی گەلۆبێژێکی، تێکڕای پۆڕان لە چریکەی خۆیان دەوەستنەوە و ڕەوەی کەوانیش لە قاسپە قاسپێ خۆیان دەکەون و بۆ گوێ ڕاداشتنێش، دەرکێ گوێیان ئاوەڵا دەکەنەوە و دەندوکانیشیان، لەسەر زار و زمانانیان کلۆم دەدەن و بە بێ هەست و دەبنە گوێگرێکی وشە و ئاوازی گەلۆی!

خۆشەویستان، لە چاوپێداخشاندنێکی پەخشانە شیعری گەلۆیدا، بە چاکی بۆمان دەردەکەوێ، ئەگەر وشە و ئاوازی ئەو گەوهەرە پڕشنگدارەمان، لە لایەنی هونەرمەندێکی گەلێك هونەر بەرزە بالاوە وەبەرهەم هاتووە و وشە و دانەر بە جۆرێکی ئاوێتەی یەکدی بوون و تێکدا تواونەوە، کە بوونەتە هۆی وەبەرهێنانی ئەم دەنگ و ئاوازە داودەییەی[1] گەلۆیەکەمان!

لێرەدا ئەوەی جێی داخە، لە کاتی تۆمارکردنی گەلۆیەکەماندا و هەر هەموو ئەم جۆرە هونەرانەشدا، هیچ جۆرە گرنگییەکی هونەرییان نەدراوەتێ و بە بێ دەربەستی لە مالان و لە نێو خێزانانـدا تۆمار کراون، وەکو لە ژوورێکیدا کە منداڵ دەگریا، ژن لانکەی ڕادەژێنێ، کچ بە چا تێکردنێوە پیالە و ژێرپیالان بە زرینگەزرینگ دێنێ، مام پیرۆتە پیر بە سەبیلە کێشانێ بێجگە لە دوکەڵکردنێ، کردوشیەتە

---

[1]- ئامارژەیە بە داود پێغەمبەر کە دەنگی خۆش بووە و بەو چوێندراوە. (ئنستیتیوت)

کۆخەکۆخ و جار جارەش سیڕە سیڕ و جیڕە جیڕی دەرکە کردنەوێ و پێـوەدانێی ئـاوازێکی زێـدە نـاخۆش و نـامۆی ڕوو گـرژهێن و، شـێواندنێکی بێـزار دێنێتـە گـۆڕێ، بـەڵام هـەر وەکـو پێشـینە گوتـوان گوتویانـە: "خەسـار لـە نیـوەی وەگـەڕێ هـەر باشـە". دیـارە ئـەم نیـوە گەڕانـەوەش لەبـەر ئەوەیـە ڕۆژێـك دێـت دڵسـۆزان و هونەردۆسـتانی لێپرسراو خۆیان چاکی بکەنەوە.

لـە لایـەکی دیکەشـەوە گەلۆبێـژە نەخوێنـدەوارەکان، کـە پـارێزەری مانەوێ هەموو ئەم جۆرە هونەرە فۆلکلۆرییانە بوون، هەر گۆیندێکیان بە جۆرێك کـەم و زۆر هەڵـەیان تێدا کـردووە، هـەر وەکـو لـە شـوێنێکی دیکەدا باسیان لەسەر نووسراوە، جا لەبەر ئەو جۆرە کارانەی باسـمان کردن، بە پێویسـتی سـەر شـانی خـۆمم زانـی، دەسـت بکـەم بـە شـەن و کەو کردنێیـان و لـە بێـژنگیان بدەم و (کـوێزر) و (لابا)یانیـان لـێ دوور بخەمـەوە و پوخـت و خـاوێن وەکـو دەبینـدرێ، بیانخەمـە بـەر دیتـەی خوێندەوار و گوێگر و گەلۆبێژانی خۆشەویست.

هیـوادارم گەلۆبێـژی نـوێش، بـە بـێ هەڵـە ئـەم مەقامـەمان بـۆ نـوێ بکەنـەوە بـە پاراسـتنێ وشـە و ئاوازانیشـەوە نـەهێڵن وە بـن لیتـەی لـە نێوچوونێ و هەڵە و ئاوازی نەشازی نائاوازی کوردی بکەون.

دیـارە گەلۆبێـژ لـەملاولایان گـەلێك زۆرن، بـەڵام ئـەو گەلۆبێژانـەی ئەگەر گەلۆیان پاراستووە و ئەمن گوێم بۆ کاسێتە پچڕ پچڕ و دەنگە خۆشـە خەراپ تۆمارکراوەکانیـان ڕاداشـتووە و لەبـەرم نووسـیونەوە و بەراوردم کردوون و ساغم کردوونەوە، ئەم گۆیندە بەڕێزانەی خوارێن: عـەلی کـەردار، حەمـەدی بـەیتان، حەمـەدی ئاغـای، ڕەسـووی مینـایی،

مستەفا دادار، فەتاحی سەوزەواری، خدری قادری، سەلاحی خزری، حەمەشینی بنگردی، هۆمەری فەقێ ڕەسووی گەرمکان.

# گـوڵێ

سەرلەوحەی عیلمی مەعانی ئەشقە
شابەیتی شیعری جوانی ئەشقە
ئەی خەبەری کزەی سۆزی ئەشق
خۆشی لە ژیان نایزانی، ئەشقە!
خەییام

# گوڵێ وەکو دەق[1]

ئەرێ گوڵێ، بەو موحەمەدەی کەم،
ئەگەر خودا بەسەریدا دەڕشتەوە عیزەتە،
خاڵەکەی سەر ڕوومەتێت: نازە، نازدارە، گوڵە، گوڵزارە، جەننەتە،
قیمەتی ئەو خاڵەم: سابلاخە، دیاربەکرە، قۆجە مووسڵی بە خڕەوە قیمەتە

١- سەرچاوەکان: کاسێت/ سێوەی مەقامبێژی کۆیی (سێوە دیان)، عەلی کەرداری بەیتبێژی موکری، خدری قادری (خدر بلوێر)، حەمەشینی بنگردی- کتێب/ دیوانی هێمن.

خولامی ئەو خاڵەی کێن و چەندن؟!
بیست و چوار دەوڵەتی دنیایەن،
سوڵتانی ئەستەمبوڵێی بە حەسرەتە!
هەر کەسێکی ئەگەر خودا ئەو خاڵەی بکاتەوە بە قیسمەتە!
بەسەریدا دەڕژێ، وەکو بارانەی بەهارێ ڕەحمەتە!
ئەرێ گوڵێ،
ئەتۆ وەرە ماچێك و بیست و دوو ڕاموسانانم
لە گەردنێ بە خاڵ و دوو چاوی بەڵەك بدەیە،
دنیا گەلێك بێ بەقایە و بێ وەفایە
نەوەکو لە نەکاو لە پڕێکی، لە یەکدی ببینەوە
دیدار ئاخیرەتە.
ئەرێ گوڵێ، ماڵێ من و ماڵە بابەکەی منت لەبەر مرێ،
ڕەندە گوڵێ.

***

ئەرێ وەرە گوڵە جوانێ، سوورە گوڵی
بەژن باریکێ، کەڵەگەتێ، زوڵف شۆڕی قەد بلوورێ
توو ئەو موحەممەدەی کەم،
ئەگەر خودا دەیخوڵخقاندەوە لە کۆیێ نوورێ
توو حەزرەتی داود کەم،
ئەگەر بۆی دەناردەوە تەورات و ئینجیل، لەگەڵ زەبوورێ،
توو حەزرەتی مووسا،
ئەگەر هەزار و یەك کەلیمەی لەگەڵ خوداوەندی میری مەزن دەکرد
لەسەر کێوی توورێ

**ئەتۆ وەرە، با ئەمن دوو ڕامووسانان بکەم**
**لە گەردنێ بە خاڵ و دوو چاوی بەڵەك**
**مردن دەعبایەکی گەلێك بێ بەزەیی و دڕندەیە،**
**نە کەس دەبوێری، نە لە کەس دەبووریێ.**

***

**ئەی گوڵێ، گوڵە جوانێ!**
**سینگ سپییە، مەمك فنجانێ،**
**داك حدودێ[1]، باب شاسەیوانێ[2]**
**ئەرێ چیمەنێ، چیمەنە هۆزانێ!**
**ڕوومەتت بە من بمێنن، بە سوورە گوڵەکەی هەوەڵی بەهارێ،**
**ئەگەر سەریان دێنایەوە دەرێ**
**لە بن بەفرێ لە تیلەگی[3] هەرامەتێ پیرەکوێستانێ**

---

١- داك حدود: دایك سەرهەد، بە مانای لە چاکی و جوانییەدا لە پۆپەی تخوبی بەرزیدایە، لێرەدا ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ، ئەگەر گوڵێی پێدا هەڵگوتراوی باسەکەمان، کچێ داکێکیە، کە ئەو هەتا ئەو ئەندازەی جوانە و لە سنووری دواپلەی بێ هاوتاییەدایە.

٢- بەڵام لە ڕاستیدا، شاسەیوان: شاهسون (شاهسەوەن)، وشەیەکی تورکیە، بە مانای (شاهدۆست) دێت. ناوی کۆمەڵە عێلێکی مەڕداری خەڵکی ئازەربایجانە، کە لە بەشەکانی باکووری ئێران و بە تایبەتیش دەشتی موغان، ورمێ، ئەردەبیل و خەرقان، لە بەینی تاران و زنجان، دەژین/ سەرچاوە: ویکیپیدیا- ئینتەرنێت. (ئنستیتیوت)

٣- تیلەك: سیلە، سوچ، گۆشە، ئەمەش لەبەرئەوەی ئەو شوێنە لاچەپەکە و ڕێبازێ هاتن و چوونێی بەسەرەوە نییە و هەمیشە گەش و زەنوێرە، شاعیران گەلێك جاران ئەم وشەیان بۆ لێکچواندنێ چاوی خۆشەویستەکەیان بەکار هێناوە. لەو بارەشەوە، عەلی باپیراغا جوانی گوتووە:

ئەمن ئەوڕۆ جەلابم لێ ڕادەوەستان لە جەلابخانێ
میرغەزەبم لێ دەغەزرین، لە چوارگۆشەی مەیدانێ
چەرخەچی[1] شامیسرییان[2] دەردەهێنا لە کالانێ
چەقۆیان لێ هەڵدەدامەوە، لە قایشی بڵغاری و هەمەدانێ[3]
تیژیان دەکردنەوە بە ئەزمی لەسەردانێ
توو بی ئەشقی خودای و ئەوێ ڕۆژێ،
ئەگەر جومعەیە و شەممەی بەسەردادێ
ئەتۆ وەرە ڕاببوورە، بە بەردەرکێ ئەوێ ماڵێ و ئەوێ بەندیخانێ!
ئەوان گرتووان بەردەوە، لەوێ گرتووخانێ.

***

ئەرێ گوڵێ لە گولاَنم زێدە،
بەژنت نەمامە لە حەوشێدا[4]

---

وتم خۆ تیلە چاوت، پێکەنی فەرمووی برۆ شێتە!
تەرازووی نازی موحبووبان، ئەبێ هەر ئەمسەرەو سەر بێ!.

١- چەرخەچی: حەسحەس، داروغە، ئەو پاسەوانانەی کە بە شەوان بۆ پاراستنی ئەمنییەت، بەنێو شاریدا دەخولێنەوە. (ئنستیتیوت)

٢- شامیسری: جۆرێك شمشێری ئەسڵی میسری بووە. (ئنستیتیوت)

٣- چەقۆیان لێ هەڵدەدامەوە لە قایشی بڵغاری و هەمەدانێ: مەبەست لە تیژکردنی چەقۆیە، لە هێندێك تێکستدا قایشی بڵغاریش بەکارهێندراوە.

٤- ڕاستیەکەی (گەردەنت مەڕە دە حەوشێدا)یە و چەند تێکست و گووتنی (گولێ) هەیە لە ئەدەبیاتی فۆلکلۆری کوردیدا، لە دانەیەکیشیاندا نەگووتراوە (بەژنت نەمامە لە حەوشێدا)، بەڵکو ئەوە ڕای نووسەرە و بە مەزەندەی خۆی پێی وایە کە بەیتبێژەکان بە هەڵە کوتویانە (گەردەنت مەڕە دە حەوشێدا). وەك لە پێشەکیی کتێبەکەشدا ئاماژەمان پێداوە، نووسەر لە کۆی چەند تێکستێك، بە لێکدانەوەی خۆی، تێکستێکی نوێی

گەردنت زەردە شیبایە شەویی لێدا
زوڵفت پەخش و پەرێشان دەبوونەوە بێر و بەوێدا[1]
هەتا ئەورۆ سوورە گوڵەکەی من بووی
ئەدی بۆچی ڕووی مەرحەمەتێت، لە من وەرگێڕا و قەولت بە کێ دا؟
ئامان گوڵێ، لە خۆشی ساڵانت دەست لە من بەردا!

***

ئەرێ گوڵێ، ئامان[2] گوڵ لە خەوێ هەڵدەستی،
بەژن بڵندێ، شەنگ و شۆڕێ، پشتی دەبەستی،
ئەگەر هەنییەی[1] گوڵە جوانێ، بە من بمێنێ بە مانگێ لە چواردە و پازدان،

---

دروست کردۆتەوە. پاساویش بۆ ئەوەی کە ئەوەی نووسەر هەڵەیە: یەك/ هەرچی بەیتی لەو جۆرە هەیە، لە کەش و هەوا و ژیانی سادەی گوندی پڕ لە فۆلکلۆردا خوڵقاوە و مێژووی هەر یەکێکیشیان لانی کەم بۆ سەد ساڵ دەگەڕێتەوە، هیچ ماڵێکی گوندیش، لە سەد ساڵ لەوەپێشدا، حەوشەیان نەبووە تا نەمامی تێدا بێت و هەر گوندێك بۆ خۆی خاوەنی ڕەز و باخ و دار و درەخت بووە. دوو/ مەبەستی بەیتبێژەکان ڕێك لە (حەوشی مەڕ) بووە و، لە گونددا هەموو ماڵە مەڕدارێك شوێنێکی تایبەتی هەبووە مەڕی تێدا مۆڵ کردووە، کە لە فەرهەنگی مەڕداریدا پێیگووتراوە (حەوش). سێ/ ئەوەی کە بەیتبێژ گەردەنی (گوڵێ)ی بە مەڕ چواندووە و نوسەر پێی وا بووە بە هەڵەدا چووە، هیچ هەڵە نیە، چونکە مەڕ و ماڵات لە ژیانی کۆنی کوردەواریدا، سەرچاوەیەکی سەرەکیی بژێوی خەڵکی بووە و مەڕ، جوانی و پیرۆزییەکی تایبەتیی هەبووە و بۆیە گەردەنی گوڵێ، بەو جوانی و پیرۆزییە چوێندراوە. (ئنستیتیوت)

١- بێرە و بەوێدا: بە ئێرە و بە ئەوێدا، بە ئەملا و لایاندا، پەخش و بڵاو.

٢- ئامان: هێمن و لەسەرخۆ، بەڵام لێرەدا مەبەست لە هاوار و پەنا بۆ بردنە وەکو: دەخیلتم ئەی مانگ - فایەق بێکەس.

که وەتانێ لە نێوانێ هەور و سامالّی جۆخینێ[2] دەبەستی!

ئامان گوڵێ، لە خۆشی سالآنت دەست لە من بەردا!

***

ئەرێ گوڵێ، گوڵە ڕەندێ[3]!!

مل بە عەباسی[4]، سەر بە سێتایی[5]، قۆڵ بە بازیبەندێ!

---

١- هەنییە: نێوچەوان، بەڵام لێرەدا هەموو ڕوو دەگرێتەوە، وەکو مانگێ تابانێ.

٢- جۆخین: خەرمان، خەرمانە، لێرەدا هێڵی بازنەیی دەوری مانگ شەوەکانی ١٤ و ١٥ی مانگەشەوان دەگرێتەوە، ئەگەر ئەو شەوانەی مانگ، شێوەکەی بازنەییانە و سپییە، ئەو هێڵەش بە دەوریدا هاتووە، پێی دەگووتری خەرمانە، هەر وەکو لە گۆرانییەکی فۆلکلۆریدا هاتووە کە گۆرانیبێژ سوێندی پێ خوادووە:

قەسەم بەو مانگەی خەرمانەی داوە

هێشتا مەیلی تۆم بە کەس نەداوە.

٣- ڕەند: ڕێك و پێك، گورج و گۆڵ و جوان، هەر وەکو گوتراوە "بەندەی بێ نەنگ" یان لە حەیرانێکدا هاتووە:

"ڕەندێ بە من ڕەندی

ئەگەر ئەتۆ مامزێ قەفارێی

ئەمنیش سۆنەی دەربەندی...".

٤- لە کۆندا ڕەنگی ڕەش، ڕەنگی ئالآی سەفەوییەکان بووە، وەك نیشانەی ماتەمینی بۆ ئیمامانی شیعە و بە تایبەتیش ئیمام حوسێنی کوڕی عەلی ئەبوتالیب. هەروەها دراوێکی سکەی سەردەمی شاعەباسی سەفەوییش بووە، کە لە کۆندا لای زێڕنگەر ڕێکخراوە و ئافرەتان وەك خشڵ بۆ جوانی بە مل و سینگی خۆیاندا کردووە. لە بەیتەکەشدا وێدەچێ هەر مەبەست لەو جۆرە خشڵە بێت. (ئنستیتیوت)

٥- سێتایی: تێکەڵکردنی سێ پارچەی لەسەر بەستنێ، وەکو پارچەکانی هەوری، سرکەیی و مشکی، کە لە زوودا بۆ لەسەر بەستنێ ژنان و ڕازاندنەوان بەکارهێندراوە، هەر وەك جەمەدانە و مشکی بۆ پیاوان.

هەر کەسێکی ئەگەر پرسێکی[1] لە مابەینێ ئەمن و گوڵە جوانێ بکا،
حاڵی بە حاڵی کوڕی پاشای یەمەنێ[2] بی،
کە وەتانێ بە قسێ بەکری مەرگەوەڕی[3]
کەوتۆتەوە حەپس و هەرامەتە[4] بەندێ
داد گوڵێ، لە باغانم نەماوی بۆچت دەست لە من بەردا؟!

***

ئەرێ گوڵێ، گوڵ ئەسمەرێ
کەزییە شۆڕێ، چاو سەقەرێ

---

١- پرسێکی: گوتێکی خراپ، درۆ، بوختان، دووزمانی.
٢- کوڕی پاشای یەمەنێ: مەبەست کاکە مەمی ئاشقی خاتووزینێیە، ئەگەر بە فێڵ خستیانە بیرێوە و فەوتاندیان. بە ڕای من ئەم یەمەنە شوێنێکی کوردستانی باکوور بووە، نە وەکو یەمەنی خوارووی خۆراوای نیوە دورگەی عەرەبی، بەڵام ئەگەر عەرەبە ئیسلامەکان داگیریان کردووە، ناوەکەیان گۆڕیوە، هەر وەکو چۆن ناوی (تونجەلی)یان کردە (دێرسیم) و (ئامەد)یش بوو بە (دیاربەکر) و (ئابار) بۆ (جزیرە)، هەر بەو جۆرەی، یەمەنیش تێدا چووە. ئەمن جارێکم ئەو یەمەنە لە نووسراوێکیدا دیتوە، بەڵام لەم کاتەی ئێستادا زۆری بۆ گەڕام، بۆم نەدیترایەوە.
٣- بەکری مەرگەوەڕ: ئەو پیاوەیە، ئەگەر لە کن کەسانی خاتووزینێ دووزمانی لە کاکەمی کردووە، بە فێڵ فەوتاندیان. بەکر خەڵکی گوندی مەرگەوەڕی بووە، ئەم گوندەش ئێستێ لەسەر دەوڵەتی ئێرانێیە، وێدەچێ ئەو سەردەمەی، لەسەر دەوڵەتی عوسمانی بووبێ، چونکە ئەو گوندە زۆر سەر سنوورە و مێژوویشە، گەلێك جارانیش هەردووك گوندی تەرگەوەڕ و مەرگەوەڕێ، بە هۆی سەرکەوتن و شکستی شەڕانەوە، ئەمدیوە و دیویان پێ کراوە.
٤- هەرامەت: هەرامە، هێن، وانێك، شتۆکە، ئەمانە جێناوی داپۆشەراون، بە گوێرەی ئاخاوتنێ دەڤەران، دەگۆڕدرێن و لەبەر مەبەستەکانی شاردنەوێ، یان لەبیرچوونەوێ پێویستییەکی، لە کاتی گوتنێدا دەگۆڕدرێن.

خواکەی لە تاقان، لە پەنجەران، لە شانشینان، لە دوو دەرییان،
لە چوار چرایان، لە کەناران، سەر بێنە دەرێ،
لە کەست کردوین و ناکەین گوزەرێ
ئەرێ برادەرینە،
ئەمن هەرچەندی حەکیم و لوقمانم دێنە سەرێ،
حەکیم و لوقمان دەڵێن برینداری گوڵێیە و پێی نابەین زەفەرێ[1]!

---

١- زەفەر: توانا، لە بنەچەدا وشەکە (ظفر)ی عەرەبییە و لێرەدا باش کوردێندراوە و چاکیش بەکارهاتووە.
ئاشق، برینداری شیر و تیران نییە و برینەکەی برینێکی جەستەیی نییە، بەڵکو برینێکی گیانییە و لە هۆش و گۆشانیدا بڵاو بووەتەوە و تەشەنای کردووە، جا لەبەر ئەم دژوارییەی، لوقمانی حەکیم و تێکرای هەموو دەستەی پزیشکان ناتوانن چاری بکەن.
هێمنی شاعیر لە بەیتە شیعرێکی شیعری (عیشق و ئازادی)دا، ئەم مەبەستەی چاك شاعیرانە شیعراندووە، کە دەڵێ:

بە تۆ چارەی چلۆن دەکرێ، دەروونی پڕ لە ناسۆرم
خەساری بۆ دەکەی دکتۆری دانا، مەرهەمێکی تر!.

# دەربارەی گوڵێ

دیارە ئەگەر وشەی گوڵێی ناوی مرۆڤ، لە وشەی ناوی سروشتی گوڵی ڕووەکەوە وەرگیراوە، جا لەبەر جوانییەتییە گوڵی باخانیش، ئەم ناوە بۆ ڕەگەزی مرۆڤی مێیینە خوازراوە و، پیتی (ێ)ی ئامڕازی مێیینەی پێوە لکێندراوە و گوڵی باخانیش بووە بە گوڵێی مرۆڤ و ناوێکی زێدە قەشەنگیشە و بۆ هەردووک جۆرەکانیش درەوشاوەیە، هەم بۆ ئافرەت و هەم گوڵ، هەر یەك بە جۆری خۆی.

جا بۆ ئەوەی ئەگەر گوڵێی ئافرەت جوانییەتییە هەموو جۆرە گوڵەکان بگرێتە نێو هەناوی خۆی، دانەری بابەتەکەمان دڵی بەرایی نەداوە، کە تەنیا ناوی تاکە گوڵێکی لە گوڵەکانی وەکو گوڵە وەنەوشە، شەوبۆ، نێرگز و هەڵاڵە و...هتد، بۆ خۆشەویستەکەی خۆی بخوازێ، هەر لەبەر ئەوە، وشە گشتییەکەی هەڵبژاردووە، کە جوانییەتییە هەموو گوڵەکانی دیکە، لە خۆی بگرێ بە ئامڕازی (ێ)ی مێیینەش، گوڵە هەمووەکە، بووە بەو گوڵێیە کیژۆڵە، خان و مان و ناسك و نازدارەی، کە هەمیشە بیرمەندان و شاعیران و نووسەران، جوانییەکانی گوڵی ڕووەك و گوڵێی ئافرەتیان بە یەکدی چواندووە و شیعر و پەخشانەکانیشیان، پێ ڕازاندوونەوە و بوونە شانازی پێوەکردنێ.

دانەری دەقی گوڵێ، بە ئاوری ئەشقی گوڵێی خۆشەویستی خۆی گڕی گرتووە و گوڵێی گوڵ و گوڵخونچەش، بیر و هۆشی هەژاندوون و زار و زمانی وەدەنگ هێناون و بە شێوەی وشە و دەستەواژان خۆشەویستییە گوڵێی دەربڕیوە. پێشییەوە دیارە گەر دانەر بۆ وشە

دەربڕین و ڕیزکردنێ و ڕێکخستنەوێشیان، هیچ زۆرییەکی لە خۆی نەکردووە، بەڵکو هێرشی لەشکری زۆری بەهێزی نێو دڵی پڕ لە ئەشق، وەسەر بیر و هۆشانی گەڕاوە و پاڵەپەستۆیەکی ئەستەمیان خستۆتە سەرێ و، دانەریش بە نووسین و ڕیزکردنێیان، خستوونییە سەر کاغەزان و بەرچاوان و لە دواتریشدا بۆ نێو گوڵێیان و بەم جۆرەش فەرامۆشییەکی داوە بە دڵی خۆی و هێرشی هەڵچووی وشانیشی پێ هێور کردوونەوە، هەر وەکو پێشینە گوتویانە: "فرمێسك ڕشتن، ئارامی گیانە". دانەریش هەر بەمجۆرە دەربڕینەی، لە خەمان وە دوور خستۆتەوە.

ئاشقانی گوڵێ گەلێك زۆرن، دانەری دەقی پەخشانە شیعری گوڵێش، ئازارەکانی خۆی و هەموو ئاشقەکانی گوڵێی، بە هەڵڕشتنی کۆی وشەکانی، وە دوور خستوون، هەر لەبەر ئەوەشە ئەگەر لە گوڵێ دەپاڕێتەوە و بانگی دێڵێتێ و پێی دەڵێ:

ئامان گوڵێ، گوڵە جوانێ، خواکەی گوڵێ!
ئەتۆ سەر لە تاقان، پەنجەران، شانشینان، دوودەریان
لە چوار کەناران، بێنە دەرێ،
ئەوان گرتوان، ئاشقان، بەردەوە لە بەندیخانێ!

لێرەدا بە چاوی خەیاڵ دەبیندرێ، ئەگەر ماڵی گوڵێ هەڵکەوتەی سەرپەڕی ئاوەدانییەیە، خانووێکی گەورەی دوو نهۆمی بە پەنجەرەی حەوش و حەسار و بەر دەرك فراوانە، کانیلێکی بە گۆمە ئاوی ڕوونی لە تەنیشتێ، لای خۆرهەڵاتێیە و دار تووێکی لەسەرە و لە ئەمبەرەوبەرانیشی، بە درێژاییە جۆگەلەی دەراوێ کانیلێ، شۆڕەبی

بە شنەی شەماڵی بەژنیّ خۆیان بڵند و نەوی دەکەن و وە لار و لەنجەیان دەخەن و زوڵفانیشیان بێر و بەوێدا دێنن و دەبەن و وەبەر هەوایان دەدەن و بڵاویان دەکەنەوە و وەکۆیان دێننەوە و بە قەدی خۆیانیشیاندا، کەزییە شۆڕیەیان پیّ دەنوێنن و وە ئارامگریەیان دەهێنن و تێهەڵدەچنەوە و شۆڕ دەبنەوە و...هتد.

دەرماڵیّ بە پەرژینیّ ماڵیّ بابی گوڵیّ خانیّ، دیوی نێویێی بە جۆرەهای ئەو سەوزە پێویستیانەیە، کە ڕۆژانە بەکار دێن، چواردەوری دەرماڵێش بە ڕووەکە باخی گوڵی پشکوتوو و نەپشکوتوو و خونچەی ئاونگ لەسەر دەورەدراو دەدرەوشێتەوە. ئەگەر گوڵیّ خانیش، وەکو نەریتی سبەینانی بێتە خواریّ بۆ گوڵچنینیّ، ئەوە گوڵگوڵیەکە، چەندان جارانی دیکە ڕازاوەتر و سەرنجڕاکێشتر و بەکێشتر خۆی دەنوێنیّ!

گوڵێی نێو باسەکەمان، تاقانە کیژی ئەو مەزنە ماڵە چوارکەنارە بە تاق و بە پەنجەرەیە، ئەو مەزنە ماڵەش، بە هۆی گوڵەجوانێوە، ڕووگەی گەنجایەتییە هەموو گەنجی ئەو دەور و دەڤەرەیە.

لێرەدا وەکو لە دەقەکەیدا دیارە "ئەوان گرتوان بەردەوە لە بەندیخانیّ"، وا وێدەچیّ کوڕە لاوەکانی دەڤەر و دەوروبەریّ، شەوانە وەکو نەریتی سروشتە تەمەنی گەنجایەتییە، هەموویان هەر کەسە و لە بن پێخەویّ نووستنیّ خۆیدا، گوڵەخانیّ بکەن بە بووکی ڕازاوەی نێو چوارچێوەی ئەندێشەکانیان و بە خەیاڵی بووکێش، سەرینیّ لە باوەشیّ خۆیان وەرێنن و ئامێز و باڵاگوشیە و سینە بە سینەوە، بە دەمدەمانەوە بکەونە گەوزگەوزانیّ، بەڵام سێبورییە دڵیان نایە و ئاوری ئارەزووانیان دانامرکیّ.

جا لەبەر ئەو ئاسوودەنەبوونەی، هەر کەسە و بە تەنێ بۆ خۆی بڕیار دەدا، ئەگەر سبەینێ کار و پیشەی ڕۆژانەی خۆی فەرامۆش بکات و بچێتە بەردەرکەی ماڵێ بابی گوڵێ و لەسەر کانیلە و چوار کەناری ساختمانێ، بکەوێتە چاوەنۆڕیان، بۆ وەدەرکەوتنێ گوڵەخانێ، بۆ سەر لە پەنجەرە و تاق وەدەرنان و هاتنە خوارێ، بۆ گوڵچنینێ گوڵەباخان و دەرماڵەکەی بکاتە گوڵزار و گوڵستانێکی گوڵ گوڵی دیکە.

ئاشقانی گوڵێ، هەر یەك و دوو نین، کە جێبەجێکاری بڕیارەکەی شەوێیان بهێننە دی، بەڵکو ڕێبواری ڕێیە هاتوچۆیان و کاروانچیانیش، خۆیان تێکەڵێ چاوەڕوانییە سەر وەدەرنان و هاتنە خوارێ گوڵێیان کردووە و بێ خەم، بەرابەری دەرکە و پەنجەران خۆیان لێ بە عەرزی داداوە و کاری ڕۆژانەی سەرەکییان لەبیر چۆتەوە و دەڵێن هەرچی دەبێ با ببێ، کەر و بار، بە قوربانی لەنجە و ڕۆیشتنێ بالآی بڵندی گوڵێ بێ! خۆ هەموو مانگان، مانگی ڕەمەزانێ وەدەرناکەوێ !!

ئێستێ سپێدەیە و زەردە سەرنگێوە، گوڵێش تازە لە خەوێ هەڵدەستێ و بە چاوی ئالوودەخەوەوە لە پەنجەرانڕا، سەر وەدەرنان و چاو ئەندازیان دەکا و کۆمەڵێك گەنجی پاڵکەوتوو و پاڵدەرەوەی لە هەر چوار کەناران، بەرابەری چاوەڕوانیکراو دەبینێ، پێیان دەڵێ: هەستن، بڕۆن، ئەو بەر و بەردەرکەی بەجێ بێڵن! خۆ ئەوە شێت نین چتان لێرە دەوێ؟!

بە بینینێ سەر وەدەرنان و بیستنێ دەنگ و ئاوازی گوڵێ، تێکڕایان بێ هۆش دەبن و لەوێ خەستە جەستە و لێکەوتە دەکەون و هەر وەکو کوژراو و برینداری پاشماوە و بەجێماوی نێو مەیدانێ دوای شەڕی لێکدانێ دوو لەشکران، ئەوەی گیانی سپاردووە

ئاسووده بووه، ئەوەی بێ هۆشیشە نادیارەگیانە، دڵبریندارانیش بە ئازار و هاوار و ناڵە و نوزەوە دەتلێنەوە.

گوڵێ داوا لە جەللاب و جەللادان دەکا، ئەگەر ئەو خەڵکانە دوور بخەنەوە، با لێرە نەمێنن.

لەو دەنگەدەنگ و کاتەیدا، بێ هۆشێك هۆشدار دەبێتەوە، سەری خۆی بڵند دەکا و چاوانی هەڵدێنێ و گوڵێ دەبینێ و پڕ بە چاوانی، سەرنجانی ئاراستە دەکا و بەم بەیتە شیعرەی سالمی ساحێبقڕانی شاعیر، بە ناڵاندنەوە ڕوو لە گوڵێ دەکا و دەڵێ:

حاجیب گەر بمکوژێ ناڕۆم، بە زوڵفی تۆ قەسەم
لەم دەرە پێی خەیاڵم، ئەڵبەتە زنجیری هەیە[1]

ئەمن بە بۆچوون و کەمۆکە لێکدانەوەی خۆم، دەقی ئەم پەخشانە شیعرەی، زادەی بیرێکە لەگەڵ نێوەرۆکی شیعرێکی مەحویدا پێکەوە لە یەك سەرچاوەوە سەرهەڵدە و گەشەکردە بوون، ئەمیان بە پەخشانە شیعر و ئەوی دیکە بە شیعری کلاسیك.

لە لایەکی دیکەشەوە پەخشانە شیعرەکە، بەندیخانەی هەیە "خواکەی گوڵێ ئەوان گرتوان بەردەوە لە بەندیخانێ"، بەڵام لە شیعرەکەی مەحویدا خەستەخانە هەیە، دیارە لە هەردووکیشیاندا ڕووی لە یەکدیچوون هەیە، کە ئەو ڕووە لە یەکدیچوونەش ئەگەر وەکو دەگوترێ "کەڵ بە موێ بەند بێ!" و گیرۆدەی خەت و خاڵان بێ، یان نەخۆشی خەستەخانەی دەردی بێ دەرمانی ئەشق بێ. دیارە

---

١- دیوانی سالم (عبدالرحمن بەگی صاحبقران)، کۆکردنەوە و لە چاپدانی گیوی موکریانی، چاپی دووەم، چ(کوردستان)، هەولێر، ١٩٧٢.

لـــه هەردوولایانـــەوە، هـــەر گیرۆدەبوونـــێ دەردی نەخۆشـــییە ئەشقەتییەیە، هەر وەکو مەحوی دەڵێ:

لە سەیری خەستەخانەی ئەوی سەوزەی کەواشینە[1]
لەسەر هەر خەستە دێ، یا خوێندنی یاسینە یا شینە
شەهیدی غەمزەیە بەعزێ، سەقیمی عیشوەیە جەمعێ
دیـارە سەرنویشـتی ئـەهلی دڵ، یاسـینە یـا شـینە
لـە بـەنگ ئـەم بەنگیانـە چـی دەبـین: خـۆ لـە خـۆ گـۆڕان
لـە دنیـادا مـەداری عـەیش و خۆشـی: خۆنەناسـینە[2]

---

١- شین: ئەم وشە بۆ ڕەنگی خۆی و لەباتی سەوزیش بەکاردەهێندرێت، هـەروەها بە کینایە بۆ تازیە و گریانیش بەکادرێت:

بەهارێکی کەوا خۆ بێ، نەیێ، هەی بێن و شینێ کەین
فەلەك هەر شینە، سەحرا شینە، کێو لێوی جۆ شینە
دیوانی مەحوی... لێوی جۆ: لێواری جۆگا

٢- دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو.

# نێوەشەوە[1]

شەوان شەو ناڵ و ڕۆژان ڕۆڕۆمە
هەمووی لەدوری باڵاکەی تۆمە

## دەقی نیوەشەوە

ئەمن سەدایەکم دەگەیشتێ، براینە برادەرینە،
سەدایەکە لەوی دە هەوەڵێ،
تەقە تەقە لە هەوران و، گڕە گڕە لە بایێ و،
قژە قژە لە پیرەخەزەڵێ[2]
ئەمن بۆت هەڵدەڵێم، بە هەلالێ، بە بەیبوونێ، بە شلێرێ،
لەگەڵ گولوکە جووتێرەی[3]، ئەگەر خۆی هەڵدەگرێ
لە بۆ خزمەتی بارانەکەی هەقەپەڵێ
داد لە من نیوەشەوە...

***

١- خدری قادری سەردەشتی (خدر بلوێر)، تایەر تۆفیق، سەلیمی باییزی پشدەری، برایمی حەمە عەزیزی پشدەری- کاسێت.

٢- خەزەڵ: خەزاڵ، زەرد، گەڵای زەردی درەختی پاییزان، خەزەڵوەر، زەردوەرین، ناوی مانگێکی پاییزانە بە ناوی گەڵای زەردی درەختی پاییزانەوەیە، پێی دەگوترێ خەزەڵوەر، گەڵاڕێزان، گەڵای زەرد وەرین.

٣- گوڵوکە جووتێرە: گوڵێکی ناسکی سپییە، لاسك و گوڵەکەی وەکو یەکدی سپی و ناسکن، پاییزان لە زەمینێ وشك و ڕەق، سەر دێنێتە دەرێ و هەتا بارانێ پەڵێ دەمێنێ، لە دوای بارانی پەڵێش دەپووکێتەوە و نامێنی.

ئەمن سەدایەکم دەگەیشتێ، براینە برادەرینە،

سەدایەکی گەلێك لە من بە ئێشە

کوڕ دەڵێ: کیژێ ڕەبی بێنێ[1] تۆ بە من بمێنێ

بە بێنێ هەڵاڵێ، سوورە گوڵێ،

ڕەشە ڕێحانێکی لە وانی دە بۆنخۆشە.

کیژ دەڵێ: هەتیوە لاوکە[2]، ئەگەر ئەمن ڕووی ڕەحمەتێ لە تۆ وەربگێڕم

شەرتبێ بە شەرتی خوا و پێغەمبەران

ڕۆژێ ڕووناك، لە تۆ دەکەمەوە بە شەوی دە ڕەشە

داد لە من نیوەشەوە!

***

ئەمن سەدایەکم دەگەیشتی، براینە برادەرینە

سەدایەکی گەلێك لە من لەسەرە[3]

کیژێ ئەمن خانووێکی لە بۆ تۆ دروست دەکەم

سەری بە تاق و بنی بە دیوەدەرە

خۆ ئەمن حوکمێ حەزرەتی سولەیمانیم پێ نییە،

ئەگەر حوکمێ بکەم، لەسەر ئەوان تەیر وتواران،

بێنەوە سەر سەری بەڵقیسایە و بگرنەوە

سوکەڵە سوکەڵەی دە لەنگەرە[1]

---

١- بێن: بۆن.

٢- هەتیوە: بانگکردێکی خۆشەویستانەیە، نەك مەبەست بێ لە کوڕێکی بێ باب (ذم في باب المدح)

٣- لەسەر: لە توانابەدەر، کەللەیی، کەسێك زوو هەڵبچێ یا توورە بێت. (ئنستیتیوت)

**تاویّ[2] هاوینیّ گەلێك بەتینە،**
**هەتا، هەتاو لە کوڵمەی بەڵقیسایە نەکاتەوە هەتەریّ**
**داد لە من نیوەشەوە!**

***

**ئەمن سەدایەکم دەگەیشتیّ، شەوە، لە من نیوەشەوە،**
**کیژ دەڵیّ: ڕەبی خودایە هەڵکەیە بایەکی زێدە بە دەوە[3]**
**هەتاوەکی ئەگەر گولەکەی مێردان، لە ماڵیّ مردوویدا هاتەوە**
**سەرە و دەریّ بۆ ماڵیّ خۆی نەکاتەوە،**
**نەوەکی کوڕە لاوەکەی من لە شەوی دە نیوەشەوێدا،**
**لەسەر سینگ و مەمکی نەرمی ئەمنی قەلەندەر و بابان وێرانەماڵیّ،**
**ڕاست بکاتەوە لە خەوە!**
**داد لە من نیوەشەوە!**

***

**ئەمن سەدایەکم دەگەیشتیّ، برایبنە برادەرینە،**
**گەلێکم درەنگ بەویّ سەدایەی[4] دەزانی**
**ئەمن نەمدەزانی ئەگەر هەلاّلە و بەیبوون**
**لەگەڵ گوڵوکە جووتێرەی،**
**لە منیان گرتۆتەوە دەراو و کانی!**

---

**١- لەنگەر: ڕاوەستانێکی ڕێك و پێك و بیّ جوڵە، لێرەدا مەبەست ڕاوەستانی باڵدارانە لە ئاسمانیّ، هەتا سێبەریّ لەسەر بەڵقیسایە بکەن و هەتاو بێواری نەکا.**
**٢- تاو: هەتاو.**
**٣- بە دەو: بە غار، تیژڕەو.**
**٤- سەدا: هەواڵ، دەنگ، لە زمانی عەرەبیدا بە (صدی- دەنگدانەوە) دێت.**

دەك ڕەببی مەخسوودیٚ[1] هەموو مەخسووددااران
لە کن خوداوەندی گەورە، حاسڵ بیٚ،
بەڵکو مەخسوودیٚ ئەمن و بەژنەکەی باریکیش، حاسڵ بیٚ،
لە شەرافەتەکەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی[2]
داد لە من نیوەشەوە.

***

ئەمن سەدایەکم دەگەیشتیٚ، گەلی دۆست و برادەران،
لە گوینە[3]، سەدایەکی گەلێك لە من بەسەر بیٚ!
دەك ڕەببی بەدکار هەر تەفرەقە و دەربەدەر بیٚ،
کۆڵەکەی نێو ماڵێی، بە حەزیایەکی حەوت سەر بیٚ،
مانگایەکیان هەبیٚ دۆ نەدەر بیٚ[4]
هەر چاوێکی هەبیٚ،
ئەویشی بەقەدەر کۆچەرخێکی[5] تەم لەسەر بیٚ،
گەورەیان لەسەر قەبران بن

---

١- مەخسوود: مەقسوود، مەبەست، ئاوات و نیاز، لە بنەچەدا وشەکە عەرەبییە و بە تێکشکاوی کوردێندراوە.

٢- شێخ عەبدولقادری گەیلانی: لە ٤٧٠ ك - ١٠٧٧ ز لە گەیلانیٚ ئێرانیٚ لە داکیٚ بووە، لە ٥٦١ ك - ١١٦٧ ز لە شاری بەغدایە کۆچی دوایی کردووە و گۆڕ و مەزارەکەی لەوێیە، لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا چووەتە بەغدا و لەویٚ شێخایەتی کردووە، هەر لەوێش مردووە، دامەزرێنەری ڕێبازی سۆفیانەی قادرییە، سەردەمەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی خەلافەتی عەباسی، لەسەر مەزهەبی حەنبەلی بووە.

٣- لە گوینە: ڕەنگە، وێدەچیٚ، لەوانەیە.

٤- دۆ: لە زاراوەی ئاژەڵداریدا، لە باتی سەرجەم بەرهەمە سپیاییەکانی ئاژەڵان دیٚ.

٥- ئامێرێکی بچووکی نێو چەرخی ئاگرکردنەوی بووە لە کۆندا.

چوکانیان، هەموانیان یاسین لەسەر بێ

داد لە من نیوەشەوە!

***

کیژ دەڵێ کەڵەبابێك لە سەری گەڕەکێ دەخوێنی،

کەڵەبابێك لە ژێرووی گەڕەکێ دەخوێنی،

دەك ڕەببی کەڵەبابە، ئەگەر سووری ئەگەر شینی

قەت کەست لە ماڵێ ساحێبیدا نەمێنی،

ئەگەر ئەمن لە حەدەحەدی[1] نیوەشەوێدا،

بۆ بێبەختییە من، گولێکی دە گولەمێردان،

بە ڕیشێکی قژنۆکە و بە سمێڵێکی چڵماوی وەخەبەر دێنی،

نەوەکی کوڕە لاوەکەی من

لەسەر سینگ و مەمکی منی قەلەندەر و بابان وێران، ڕابپەڕێنی

داد لە من نیوەشەوە!

***

ئەوە شەوە، نیوەشەوە، شەوی دە شەواران لە من گەڵێك بە شڵێڵن[2]

دەرکێ ئەوان گەورە ماڵان، میرە ماڵان، لە من بە کڵێڵن[3]

ئەوە بەقایە مەکەن، بە وان[4] گەورە کیژان

---

١- حەدەحەد: کاتهاتنێ سنووری هەر شتێکی، بۆ پێگەیشتنی تەواو.

٢- شڵێڵ: قوڕ و چڵپاوی بە لیتە.

٣- کڵێڵ: لە (کلۆم)ەوە هاتووە، کە جۆرێك دەرکە داخستنێ دیوی ژووریێ بووە لە کۆنـدا. زۆر وێدەچـێ لەگـەڵ وشـەی (CLOSS)ی ئینگلیـزی لـە سەرچـاوێکیەوە هاتبن و ڕۆژگاری درێژ گۆڕانی تێدا کردبن.

٤- بەوان: کورتکراوەی (بە ئەوان)ە. (ئنستیتیوت)

ئەگەر لەبەر باب و برایان ناوێرن
بەقایە مەکەن بە وان بێوەژنان،
چەندی بە فەندن، چەندی بە فێڵن!
ئەمن ڕۆژی بیست و چوار جاران
دەبم بە خولاّم و خزمەتکاری
ئەو شێرەژنانەی ئەگەر لە حەدەحەدی نیوەشەوێدا
لانکە و بێشکان،
بەسەر گولەکی دە گولەمێرداندا بەجێ دێڵن
داد لە من نیوەشەوە!

# نیوەشەوە باسێك

ئەم پارچە پەخشانە شیعرە بەنرخەی نیوەشەوەی خوێندمانەوە، یان گوێبیستی بووین، بەرهەمێکی گەلێك قەشەنگ و گرنگ و مانادار و بەهێز و زاراوە ڕەسەنی زمانی کوردییە، خۆکرد و دەستکردی هونەرمەندیی کەسێکی ئاشقی پێشڕەوی پلەبالای ئاشقانە.

بە نێوەرۆکەکەیدا دیارە ئەگەر بە هۆی خۆشەویستییەکی کەموێنەی بە ئاکام نەگەیشتووی نێوانێ کوڕ و کیژێکییە، وە لە بنی قوولایی دڵی کوڕ و کچێکی ئاشقەوە تروسکەی لێ پەیدا بووبێ و گڕ و بڵێسە و پەرەی ئەستاند بێ و بلاو بووبێتەوە و، بە خەیاڵی دەست بۆ بردنێکی باخی بەیان، دانەری ئەم وشانە، بە نەرمە کۆخێکی بیگرێ، گەرووی خۆی ساف کردووە و زمانی بە جووڵە و زاری وەدەنگ هێناون، هەر وەکو چۆن بە هۆی هەور و گرمە گرم و بروسکە بروسك و ڕێژنە بارانانەوە، کانی و کانیلە دەتەقنەوە، یان سەر سینەی دەشتی زەوینێ نێو کاوێ چیای بەهارێ، ئەم پارچەش لە ئەنجامی ئەم خۆشەویستییە بە ئەنجام نەگەیشتووەیەوە، چەکەرەی کردووە و سەری وەدەر ناوە و لەبەر قەشەنگی و سۆزدارییانیشی، دەمادەم لە یەکدی وەرگیراوە و ماوەتەوە و هەتا ئێستێش، سەری فەرامۆشیان بە گوێدێرەکانی ڕادەژێنێ و دڵخۆشیان دەکا و دەکاتەوە.

دەقەکە، دەقێکی چڕ و پڕە، وەکو درەختێکی بەردەری نێو مێرگێکی زەنوێری بژوێنی سەر کانی و ئاوێکی هەمیشەئاو وایە، دیارە لەبەر لەمێژیانیشی، نازاندرێ کێ ڕواندوویەتی و پەروەردەی

کردووە؟ هەر لەبەر ئەوەشە ئەگەر خاوەنێکی دیاری تایبەتی خۆی نییە، بەڵام بەخشندانە سێبەر و ئاو و دیمەنی جوان و بەرهەمی شیرینی بۆ هەموانمان هەر وەکو یەکدییە.

بێگومان ئەم دەقە بەپێزە خۆشەویستەش هەر بەرهەمی کەسێکییە، بەڵام لەبەر نادیاریی ئەو کەسەی، بووەتە بابەتێکی فۆلکلۆری گەلەکەمان و خۆشەویست و جگەرگۆشەی هەموانمانە و کوردستان داکیەتی و کوردیش باب، بۆ خۆیشی هەمیشە گەنج و گەشاوە و بە کەڵك و پەرەسەندووە.

کوردان زۆریان لەم جۆرە بەرهەمە زێدە بەنرخانە هەنە، کە لە باپیرە و داپیرانیانەوە بۆیان بەجێماون، دیارە ئێمەش وەچەی ئەو پێشینانەی خۆمانین، وەکو پێویستییەکی سەر شانمان، وا باشە ئەگەر بەدوایاندا بگەڕێین و لە نێو قوڕ و لیتەی بزربوونێیان، بهێنینە دەرێ و ئاوەشۆریان بکەین و قوڕ و لیتەیان لێ بکەینەوە و بە خاوێنی و درەوشاوەییەوە، بیانهێنینە سەر شانۆی شانازی پێوەکردنێ. ئەوجار گەوهەرناس بە تاك و كۆ بێنە سەیرێ تەماشاکردنێ و بە چاوی سەرسوڕمانەوە سەرنجیان لێ بدەن و دەستی ڕازیبوونێیان لە گێزەکێ ملی خۆیان بدەن و تەواوی نرخی شیاویان بۆ دیاری بکەن.

ئەم بابەتە بەنرخە، وەکو گشت، لەم بارەوە لایەنێکی دواکەوتوویی کۆمەڵگەی کوردەواریی سەردەمی کۆن و ئەنجامی ئەم کارە دزێوە دواکەوتوویەکەمان نیشان دەدات، کە کوڕ و کچێك دڵگرێدراوی یەکدی ویستنێ بوون، بەڵام بە هۆی باری کۆمەڵایەتیی سەردەمەکەیەوە، کچەکە بە زۆری دراوە بە کەسێکی دیکە، دیارە

ئەگـەر ئـەو کەسـەش هـەر جۆرێـك بووبێـت، چـونکە خۆشەویسـت و ویسـتی دڵگـری کچـەکەی نـەبووە و لەبـەر چـاوانی مێردێکـی گـەلێك ناحەز و دێو بووە: لە باڵادا گولەپیاو بووە، لە دیمەندا خـوار و خێس و ڕیش قژنۆکە و سمێڵ چڵماوی و، کوێرەمووشە و، لـە گفتارانیشـدا قسـە تـڕن و دەم و کاوێـژ و لالێـو لیکـاوی چـڵم هـەڵلووش بـووە، هـەر وەکو دەڵێن: (کەڵەبابی سەر بارەداری و، کاوڕی سەلەمان و، گیسـکێ بـار و بـووان) بـووە، نابووتییـە ئـەم هـەموو جـۆرە نـابووت و لات و لوتانـە، ئێسـتێش نەگەیشـتووەتە دزێـویی نابووتییـە ئـەو پیـاوە ناخۆشەویستەی کچەکەی، بـە کـورتی چارەبەدێك بووە، مەگـەر هـەر وەکـو شـێخ ڕەزای تاڵـەبانی، کـە لـە باسـی ئـەم جـۆرە پیاوانـەدا گوتویەتی و مافی ڕەوای خۆی داوە بە حەمە ناوێکی، کە دەڵێ:

لووتی وەك هەنگڵە کەندوو، چاوی وەك کوندەبەبووە
بەدفەسـاڵی وەکـو حەمـە، نـە دەبێـت و نـە بـووە!

هـەر وەکو لـە نێـوەرۆکی دەقەکەیـدا دیـارە و دەردەکـەوێ، کچـە بـە زۆری زۆردایی هێندراوەتە بن باری ڕەدا و مارەکردنێ و منداڵێکیشـی لــەو پیــاوە ناخۆشەویســتەی هێناوەتــە بەرهــەم، ناچــاری و بێدەسەڵاتیانیش، بـە ڕاژانـدنێ لانکەیـەوە لـە کـاتی نیوەشـەوێدا، بـە لایلایـە ئازارە کەڵەکەبووەکانی، خـۆی دەهێورێنـێ و خـەمی نێـو دڵـی خـۆی، بـەمجۆرەی تـەرە دەکـا، هـەر وەکـو نـازداریێ خۆشەویسـتی (ماڵمـاڵ)ی ئـامۆزای، کـە بـە زەبـری خەنجـەرێ لـە شـوانی ماڵـێ بـابی خۆی، مارە کراوە و بۆ منداڵەکەی لایلایەی دەکا و دەڵێ:

دە بنوو بنوو ڕۆڵە لایلایە، لایلایێ

ئەمن لانکێت بۆ دەکەم لە دارەکەی دار خورمایێ

وەستایانی بۆ دێنم لە شارەکەی بەغدایێ

بابی تۆ کوردێك نەبوو، کەلاش لە پێی لەبەر مەڕی[1]

بابی تۆ ماڵماڵ بوو، کەڵی لە دنیایێ.

***

ئەمن لانکێکت بۆ دروست دەکەم

لە دارەکەی دار گوێزێ

وەستایانی بۆ دێنم لە شارەکەی تەورێزێ

بابی تۆ کوردێك نەبوو کەڵاش لەپێی لەبەر مەڕی،

بابی تۆ ماڵماڵ بوو، کەڵی لە ڕێزێ.

***

دە بنوو بنوو، ڕۆڵە لا ئیلاهە ئیللاڵڵایێ

دەك ڕەببی بە بێ بابیت گەورەکەم

بۆ خاتری غەوسەکەی ماڵ لە بەغدایێ

بابی تۆ کوردێك نەبوو، کەڵاش لەپێی لەبەر مەڕی

بابی تۆ ماڵماڵ بوو کەڵی لە دنیایێ.

***

جا ئەمن قوڕێ کوێ بەسەری خۆداکەم

باب لێم ڕادەسا، بە خەنجەرێکی لەوی دە نێرۆییە

---

١- مەڕ و بزن لەوەڕێن، شوان، ئەم وشەش تایبەتە بە لەوڕاندنێ ئەو دوو ئاژەڵە تێکەڵ و لە یەکدی جوادایانەش. لەوەڕینی ڕەشەوڵاخانیش (گاڕان)، پێی دەگوترێ (گاوان)، کەسی وڵاخەبەرزە لەوەڕێنیش، پێی دەگوترێ (ڕەوکەوان).

کاك لێم ڕادەسا، بە شیرێکی لەوی دە میسرییە
داك لێم ڕادەسا، بە نانبرێشکی دە نانییە
هەر بە زۆریان لێ وەردەگرتم وەکیلییە
مارەیان دەکردم لە کوردێکی بەر مەڕییە.

وەکو لە پەخشانە شیعرەکەی (نیوەشەوە)یدا دەبیندرێ، کیژەکە گەلێك جاری دیکەی وەکو ئەمجارەی ئێرە، کوڕە لاوە خۆشەویستەکەی خۆی لە لەماڵنەبوونێ پیاوە ناحەزەکەی خۆی ئاگادار کردۆتەوە و پێی ڕاگەیاندووە، هەر وەکو دەڵێ: ئەوشۆ گولەپیاوەکەم لە ماڵێ نییە و کات کەلێنە[1] شەویش ڕاشکاوە، وەرە هەتا باوەشان لە یەکدی بدەین و سینە بە سینەی یەکدییەوە بنێین و لێولێوانێکی بکەین و هەناسەی ئاسوودەیی و ئۆخەی خۆشەویستیی یەکدی تێکەڵ بکەین و هەڵبمژین.

---

١- کەلێنە: فرسەتە، هەلە، وشەکە بە خوازەیی وەرگیراوە، چونکە وشەکە لێرەدا بۆ ڕەخساویەتییەکانی دەستپێکردنی کارێکی بەکار هاتووە، وەکو دروستیش بە مانای (درز)ی نێوانێ دوو بەرجەستە بەکار دێت.

## مەكەن مەنعی عاشقان:

گەلۆ، هەر وەكو دەزاندرێ هەتا ئێستێش شوێنەواری كاری مەنعی عاشقان، لە هێندێك شوێن لە لای كەمەكەسان لە كوردستانێدا، بوونی هەر ماوە و جارجارە دەبیسترێ و دەزاندرێ، بێگومان ئەم كارەش درێژەی نەریتی كۆنی كۆمەڵایەتیی دواكەوتوویيە، كە بە بێ ویست و حەز و ئارەزووی، بە هۆی جۆراوجۆرەوە، گەلێك كاری هاوسەرگیرییەتی ئەنجام دراون.

دیارە پێكهێنانی ئەم جۆرە هاوسەرگیرییە و خێزان دروستكردنەش، بە ئەندازێكی بەرچاو كێشەی كۆمەڵایەتیی زۆری بەدوای خۆیدا هێناون، بوونە هۆی پچڕاندنی شیرازەی پەیوەندییەتی كۆمەڵ تێكدانی ئاشتی و ئاسوودەیی نێو خێزانەكان. بەڵام بە دڵخۆشییەوە ئێستێ ئەم كارە بە هۆی پێشكەوتنی سەردەمی زانست و هۆشیاربوونەوەی كۆمەڵەوە، ساڵ لە دوای ساڵ كەمتر و كەمتر بووەتەوە و هەتاوەكو ئەم سەردەمەی ئێستێ، كە خەریكە بگاتە نەمان و بنبڕ و تەواو كۆتایی پێهاتن و لەگۆڕنانێ.

دیارە ئەم دەقە (نیوەشەوە) قەشەنگەشمان، هەر دەرەنجامی كارێكی لەم جۆرە ڕووداوە ناڕەوایانە و مێژوویەكی كاری دێرینی دواكەوتوویی پێوە دیارە و ژیانی كۆمەڵایەتیی ئەو سەردەمەی كوردەواریمان بۆ دەگێڕێتەوە و ئافرەتمان نیشان دەدا، كە لەو سەردەمەیدا چۆن هەر وەكو ئامێری كارپێكهێنەر، لە لایەن پیاوانەوە چەوسێندراونەتەوە.

جا لێرە و لە دەقی باسەکەیدا وەدەردەکەوێ، کە هەر چەندە ئەم کوڕ و کچە دڵدارەیان بە ڕەواڵەت لە یەکدی دابڕیوە و نەیانهێشتووە بە ئاکامی دڵی خۆیان بگەن و خێزانێکی بەختەوەر پێك بهێنن و بە ئاسوودەیی بژین، بەڵام هەموو دەمان ئەم جووتە لە یەکدیی دابڕێندراوە، لەبەرچاوی یەکدی بزر و دوور نەبوون لە نێو دڵ و بیر و هۆشیاندا باوەش باوەشێن و یەکسەرینی و دوو خۆشەویستانیان بە مافی ڕەوای خۆیان زانیوە، دیارە ئەگەر کچەکە هیچ کەس و نێرەوەزێکی وەکو پیاوی شیاوی خۆشەویستی دڵداری خۆی بە ڕەوا نەزانیوە و دڵی هەر لەگەڵ دڵی کوڕەلاوەکەی هاوجووت بووە، دیارە کوڕەکەش هەر بەو گوێرە گرفتار و گیرۆدەی دەستی داب و نەریتە کۆنان بووە. جا گەلی خزمان و باب و داکی کوڕ و کچان، ئەوە هەر خۆتان وەبیر بێنەوە و خوداگیرییە مەکەن و...هتد.

مەکەن مەنعی ئاشقان، ئەشق کاری دژوارە
لە ئەشقێدا سووتاوم، خەمم لە چوار کەنارە
لە برادەر و ڕەفیقان، مزدێنی بەهارە[1]

<u>تێبینی:</u>

بە بۆچوون و تێڕامان و وردبوونەوان، وا دەردەکەوێ ئەگەر لە شیعری (مەکەن مەنعی عاشقان)، کە لە گۆرانییەکی تاهیر تۆفیقیدا وەکو بەشێك دەبیسترێ، پارچەیەك بێت لە پارچەکانی شیعری (هاتەوە تەیرێ گەرمێنێ) و بە گوێرەی سەردەم، گۆرانیبێژان گۆرانیان بەسەردا هێنابێ بۆ ناوەکانی (بەهارە) و (پێشبار)، ئەوەش بە بەڵگە لێدوانی یەك بابەت،

---

١- گۆرانییەکی تاهیر تۆفیق- کاسێت.

کە ئەویش کۆتایی وەرزی زستانێ و سەرەتای وەرزی بەهارێ و جموجۆڵی گیانداران و باڵداران و مرۆڤانە لەو کاتەیدا.

لە بارەی پێکهاتەشەوە شیعرەکە هەمووی سێ دێڕییە و دوو دێڕی یەکەم و دووەم لە دیاردەکانی کۆتایی وەرزی زستانێ و هاتنێ وەرزی بەهارێ دەدوێ، دێڕی سێیەمیش تایبەتە بە هەردوو ڕەگەزی نێر و مێی مرۆڤانەوە، وەکو:

هاتنەوە تەیرێ گەرمێنێ، ئێستا زستانی ماوە
گەینە سەر چۆمی کەڵوێ، لەوێ کردیان بڵاوە
لەبەر ئەو چاوەی دەمرم، سوار و پیادەی ڕۆناوە

یان:

هاتنەوە تەیرێ گەرمێنێ، بە فڕێنێی خاسەکەوە
سۆنە و شەهێن و شمقاڕ، تەڕلانێکیان پێشڕەوە
ئەو ساڵ زستانی ساردە، وەرە جووت بین پێکەوە

نالیش دەڵێ:

پێم دەڵێن مەحبووبە خێڵ و قیچە مەیلی شەڕ دەکا
خێڵ و قیچە، یا تەرازووی نازی نەختێ سەر دەکا؟!
خێڵ و خیچە، یا بە غەمزە بۆ نیشانەی دڵ بە چاو
مەیلی ڕاست هاویتنی موژگانی دڵ پەیکەر دەکا!

## شیعرستانێکی گونجاوی شاعیران لەگەڵ شەوان و نیوەشەواندا :

* شەوانە تا دەبێ بە ڕۆژ من بێ قنیاتم
ڕۆژانەش لە جێی کەنار بێ پوڵ و لاتم
بابی دەڵێ نایدەم بە تۆ،
بێ پارە و پوڵ و ڕەنجەڕۆ
دامناوە بۆ هاوشانی خۆ، هاوار بە ماڵم[1]!

* بەڵێ گریانی نیوەی شەو دەکا ناسۆری دڵ مەرهەم
کوڵ و کۆم دادەمرکێنێ و بەجێ دێڵێ دڵی من خەم[2]

* شەو کەسێ پرسی لە خۆ دەرخستنی پەروانە، شەو
ئەو گوتی ناتێگەیشتوو! تەجرەبەی مەردانە شەو[3]

* هەق وەهایە تا قیامەت (حەمدی) باسی شەو بکەم
چونکە ڕۆژی ڕۆشنی ئەهلی دڵ و ڕەندانە شەو[4]!

* دڵم وەك حاکمی مەعزولە قوربان!
خەلاتی وەسڵی تۆی مەنزوورە ئەمشەو[5]

---

١- فۆلکلۆر، گۆرانییەکی هونەرمەند ڕەسووڵی نادری،
٢- تاریك و ڕوون، سەرچاوەی پێشوو.
٣- دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو.
٤- دیوانی حەمدی، سەرچاوەی پێشوو.
٥- دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو.

* فەرمووی لە نێو بیرە خەوێ، من قەلبی سووتاوم دەوێ
وەفایی با نەنوێ شەوێ، یا غەوسی سانی هیممەتێ[1]!

* ئافەریم شەوی پێکی ڕۆژکرتن
سنگی نەرمی تۆ، دڵی گەرمی من[2]

---

١- دیوانی وەفایی، سەرچاوەی پێشوو.

٢- بۆ کوردستان، هەژار (عەبدولرەحمان شەرەفکەندی)، چ(عیتانی)، بەیروت، ١٩٦٥.

## زاڵم[1]

چ شۆخە ئاگرم تێ بەردەدات و پێم دەڵێ یا شێخ
بە خاشاکی دەوت شوعلە عەسامە دەستی پێدەگرم

مەحوی

های وەرە زاڵم...
ئای وەرە زاڵم، ئەمن دەڵێم زاڵم
وەرە لە کنم دانیشە، منداڵم فامێ ناکەم
دوگمەی بەرۆکێت بترازێنە، با دەستت لە باغەڵێ ڕاکەم
ئەتۆ قوڕئانێك بێنە، ئەمن دەستی پێدادەم
هەتا بۆ خۆت ڕێم نەدەی، ئیختیاریان ناکەم!
هەی وەرە عەیامێ، دەی وەرە زەمانە، ئەی وەرە زاڵم.

***

ئەمن دەترسێم بمرم بەوێ ساڵێ،
بەوێ مانگێ، بەوێ ڕۆژێ
توخواکەی گەلی دۆستان،
ئەمن مردم، ئەوە کێلانم بۆ بێنن، لە تیشە تیشان[2]

---

١- لەبەرکردنێ خۆم، کە هەر لە ساڵانی سەشتەکانی سەدەی بیستەوە، ئەم گۆرانییەم لەبەر کردووە. وە زۆر هونەرمەند و دەنگخۆشیش گوتویانە.

٢- تیشە تیشان: بەردی گەورەی بڵندی قەڵشیوی لەسەر لا، لە چیایان. ئەم جۆرە بەردانەش ناویان لە چیایاندا هەیە وەکو چیای (بەردە قەڵشتی) لە گوندی مەرگێ

تابووتانم بۆ بێنن، لە پانە بەر ڕۆژێ

قەبرم بۆ لێدەن، لە نێوان جووت مەمکی ئەوێ کەڵەگەتە[1] مەرجانێ

ئەمما جێگای سەرینیم بڵندکەن

توخواکەی با لێوم بگاتەوە بەردی بەرکۆژێ[2]

---

- بنگرد، یان چیای (بەرد قەڵشیوی) لە بناری قەندیلی لە دەڤەری پشدەرێ - سلێمانی. تیشە، جۆرێکیشە لە چەکوشی بەرد شکاندنێ، هەر وەکو لەم شیعرەی ئەحمەدی موختاری جافدا هاتووە:

حەدیسی کوشتنی فەرهادی مسکین، چۆن بووە با پێت بڵێم

لە شەوقا دای بەسەریا تیشە وەختێ، کە دەنگی شیرین هات

بەڵام وێشدەچێ ئەگەر (تیشەتیشان) لە دەڤی زاڵمیدا، گوندێك یان شوێنێك بێت.

١- کەڵ: بە مانای دروستی خۆی نێرەی ڕەسیوی گامێشانە، بە شێوەی خوازەیی بۆ مەبەستەکانی بەهێزی و چاکی و جوانی بەکار دێت. لێرەشدا لەبری زێدە جوانییە بەکار هێنراوە، وەکو دیاریشە جوانییەکەی ئەو کیژە کەڵە مەجانەی، لەبەر پێگە و گونجاوییە تاك بە تاکی ئەندامەکانییەتی، کە هەموویان لە پلەی باڵادان و پێکەوە جەستەکەیان ڕێك و بەرچاو کردووە، بە (بەندەی بێ نەنگ). وێدەچێ هەر کیژێکی وەکو ئەم جووتانەش بووبێ، کە وەفایی شاعیر ئاشقی دانە بە دانەی ئەندامەکانی بووە و بۆی گوتووە:

وەفایی ئاشقی ئەندامی تۆیە

بە شەهدی قامەتی تووبا مەفەرموو

یان کەسێکی دیکەی شاعیر لەم بارەوە بە ئافرەتە جوانێك دەڵێ:

ئەی بەژن ڕێك لەنجە جوان، خاوەن سەرنج، شێوەت پەری

بۆ نیگایەك وێڵ و شەیدام، باڵی شیعرم هەڵوەری. (گۆرانییەکی نەجمەی غوڵامی).

٢- بەردی بەرکۆژێ: بەردی پانی پێداڕاهێڵدراوی سەر سینەی مردوو لە نێو گۆڕێدا، کە بە کوردی و عەرەبییە تێکەڵەکەی پێی دەگوترێ (بەردی ئەلحەدێ). وشەی بەرکۆژەش یەخەی کراوەیە لە گەردنێ هەتا دەگاتە کۆتاییە سینەی.

هەی وەرە عەیامێ، دەی وەرە زەمانە، ئەی وەرە زاڵم.

***

ئەی وەرە زاڵم، ئەی وەرە زاڵم

ئەمن دەترسێم بمرم، بەوێ ساڵێ،

بەوێ مانگێ، بەوێ زستانێ

گەلی دۆست و برادەران ئەگەر ئەمن مردم

کێلانم بۆ بێنن لە تیشە تیشان

تابووتانم بۆ بێنن لە کاولە[1] ڕیشوانێ[2]

قەبرم بۆ لێدەن، لە نێوان جووتە مەمکێ ئەوێ کەڵەگەتە کەڵەمەرجانێ

بە چاوانم وەرکەنەوە خۆڵی جێژوانێ

هەی وەرە عەیامێ، وەرە زەمانە، ئەی وەرە زاڵم.

***

ئەرێ زاڵم، وەی زاڵم

ئەمن دەڵێم دارە خڕکەڵانەکەی بەردەرکێ ماڵە بابی یارە گچکەڵانەکەی خۆم

هەتا عەیامێکی زۆر، لە من هەر دارێکی گەش و گەشەدار بێ

گەلی برادەران،

---

١- کاول: خانووە ڕووخاوی چۆڵی وێران، بەڵام لێرەو لە گەلێك شوێنی دیکەش بە شێوەی خوازەیی وشەکە بە دێرین دێت، کە ئەم وشەش سەردەمێکی نوێ بووە و ئێستاش کۆن بووە.

٢- ڕیشوان: سەیرانگا و مەزارێکی ئاینییە لە دەڤەری پشدەرێ لە قەڵادزێ - سلێمانی، دیاریش نیە کە بەیتبێژ مەبەستی ئەو (ڕیشوان)ە یان شوێنێکی دیکەیە.

وەرن دەچینەوە کوێستانێ و سەر گردێکی گەلێك بڵند و بڕوانین
هەتا هۆبە و تاوڵ[1] و چیغی ماڵێ بابی یارە گچکەلانەکەی خۆم لێ
دیار بێ

ڕەبی هەر کەسانێکی دەبێتە باعیسی دوو دلان
زکسووتاو بێ، پشتشکاو بێ و کوڕ مردوو بێ،
هەر دەردەدار و ڕێنج بەخەسار بێ
پاییزێ بەرانی نێو مەڕی بمرێ، بەهارێ گای جووتی،
زستانێ کەیخودای ماڵێ قەرزدار و قەرزدار بێ
دە وەرە عەیامێ، ئەی وەرە زەمانە، ئەی وەرە زاڵم.

***

ئەمن دەترسێم بمرم بەوێ ساڵێ، بەوێ مانگێ،
بەوێ ڕۆژێ، بەوێ ئێوارێ
بەلام توخواکەی ئەگەر ئەمن مردم
کێلانم بۆ بێنن، لە تیشە تیشان
تابووتانم بۆ بێنن، لە کاولەژەنگارێ[2]
قەبرم بۆ لێدەن، لە نێوان جووتە مەمکی
ئەوێ کەڵە نازدارە کەڵەگەتە مەرجانێ

---

١- تاوڵ: ڕەشماڵ، دەوار.

٢- ژەنگار: دەڤەر و قەزای بەڕێوەبردنە، سەر بە پارێزگای مووسڵە، هەر لەم دەڤەرەشدا چیایەکی پڕ کارەسات بەم ناوەوە هەیە، گەلێکی داستانی دێرین لە هەناوی خۆیدا هەڵگرتووە، لە زوودا عەرەبە ئیسلامەکان، داگیریان کردووە و ناوەکەیان گۆڕیوە بۆ (سنجار) لەویشەوە بووە بە (شەنگال) و ناوە ڕاستەقینەکەشی (ژەنگار)ە.

جێی سەرینێم بڵنکەن با بکاتەوە پەرەنگۆڵەی دە گواریێ

ئەی وەرە عەیامێ، ئەی وەرە زەمانە، ئەی وەرە زاڵم.

## بەردی بەرکۆژێ:

لە ئایینی ئیسلامێدا ئەوە هەیە ئەگەر کەسێك مرد، پێش ئەوەی لە گۆڕەکەیدا داپپۆشن، هێندێکی وردەخۆڵ لە دم و چاوان دەپرژێنن، وەکو ئەوەی، کە دەڵێن ئەم کارە لەبەر ئەوەیە مرۆڤ لە ژیانی زیندەگییە دنیایەدا، زۆر شاکە شاکێ پەیداکردنی چاوچنۆکێ و خۆ ماندووکردنان دەکات بۆ دەوڵەمەندبوونێ، کە خاکیش بۆ ئەمانە سەرچاوەیە، بەڵام دیارە وەکو ئەوەی، کە ئێستێ لێرەدا دەیبینین هەر چییەك و هەر چەندێکی پەیدا کردووە و وەسەر یەکدی ناوە، هەمووی بەجێهیشتووە.

بێگومان ئەم کارەی خۆڵ لە دەم و چاو پرژاندنەش، بۆ ئامۆژگارییەتییە ئەو کەسە ئامادەبوانەیە، ئەگەر بە گڵ وەسەر کردن و شاردنەوێ مردووەکەیەوە خەریکن، هەتا لە ژیانێیاندا لە پێناوێ کۆکردنەوێدا ئازاردەرییە و خەراپەکارییەتییە نەکەن. هەر وەکو عومەری خەییام، چۆن سەرزنشتێ دڵی خۆی دەکا، هەتا لە پێناوێ ژیانێدا، داوای خەراپەکارییەی لێ نەکات.

دڵە لە ژەنگی لاشە گەر پاکی

ڕووحێکی پاکی، بۆ ئەفلاك چاکی،

عەرش جێگەی تۆ، تۆ شەرمت ببێ،

### که بۆ چەند ڕۆژێ دانیشتووی خاکی[1]

گەلی دۆستان و برادەران، لێرەدا وەدەردەکەوێ، کە دانەری دەقی (زاڵم)ی باسەکەمان، هەر بە زیندوویی بە خەیاڵ خۆی مراندووە و خستوویانەتە نێو گۆڕەکەیەوە، دیارە هەر بە هەمان ئەو خەیاڵەی، کە خۆی پێ مراندووە، ئەمجارەش لە نێو گۆڕەکەیدا خۆی زیندوو کردووەتەوە و، وەسیەتان دەکا و ڕووی خۆی لەو کەس و برادەرانە دەکا دەکات، ئەگەر هەر وەکو دەستووری باو، ناشتنەکەی بە ئەنجام بگەیەنن، پێیان دەڵێ: ئەگەر ئەو خۆڵەی بە دم و چاوانمی وەردەکەن، با خۆڵی گۆڕەکەی خۆم نەبێ، بەڵکو خۆڵی زەمینێ ئەو شوێنەی بێ، ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان، یان جارێك لە جاران لەگەڵ خۆشەویستەکەم لێی بە یەکدی گەیشتووین و بڕیاری بۆ یەکدیبوونێمان لێ پێك هێناوە.

داوای دووەمیشی ئەوەیە، ئەگەر جێی سەرینێی بڵند بکەن، بۆ ئەوەی لێوەکانی بۆ ماچکردنێ بگەنە ئەو بەردە بەرکۆژەی، کە بەسەر سینە و دەم و چاوانیدا ڕاهێڵدراوە، وەکو دیارە هەر لەو خەیاڵەشدا وێنەی خۆشەویستەکەی لەسەر تەختی دیوی نێوێی بەردەبەرکۆژەکەی، وێنا کردووە. ئەم وێنایەش بەرابەری ڕوویەتی، بۆ ئەوەی لێوەکانی بگەنە نێوانی هەردووك جووتە مەمکەکانی سەرچاوەی ژینێ سەر سینەی خۆشەویستەکەی و، هەواری خامۆشی خوێیەکانیشی، بە دەنگی لەرە و لەرزەی پەرەنگی گواران، هۆشیان تێبگەڕێ و ئەگریجەی درێژ و نەرم و خاوی ئاوریشمی بەسەر دەم و

---

[1]- چوارینەکانی عومەری خەییام، سەرچاوەی پێشوو.

چاوانیدا شۆڕ ببنەوە و، جار جارەش دەمدەمانێك و لێولێوانێك، مچوڕکی خۆشیانی بە نێو دەماراندا بگوزەرێ.

گەلێ، لێرەدا ئاشکرا دیارە، ئەم خەیاڵە سەرچاوەکەی ئیشقێکی سووتێنەری زێدە بە ژان و ژواری سوێداری بە ئاوات نەگەیشتووی بێ ئاکامە، درێژە پێدانی کاری سروشتی لە مێژینەی باب و باپیر و داك و داپیر و سەرجەمی هەموو کۆمەڵی مرۆڤانە، بە خۆشمانەوە، هەر وەکو:

ئەمەش هەر یاسای سروشتە
کاری کۆنی پشتا و پشتە[1]

نێوەرۆکی دەقی زاڵمەکەمان، ئەوەی دەهێنی هاوبەشیەتییە خەمەکانی بکەین و ئازاری بەسوێی کەمێك هێور بکەینەوە، چونکە وەکو مەحوی دەڵێ، زێدە سووتنێکی گەلێك بێ ئامانە:

وتم، عیشق ئاگری گرتە وجودم
وتی هەر بابەتی سووتانە خاشاك![2]

بەڵام لەگەڵ ئەم هەموو ئازارانەشدا، ئەشق بە هەموو جۆرەکانییەوە، هەر: پاکییە، یاساییە، ڕەواییە، مرۆڤایەتییە، جێبەجێکردنی ویستێکی گرنگی خوداییە و هۆی پەرەپێدانی ئاوەدانکردنەوەی سەر زەمینێیە و هۆی بەرهەمهێنانی یەك لە دوای یەکدی پێشکەوتنەکانە! ئیدی دەپرسین، لەبەر چی بە یەکدی

---

١- گوتراوێکی نووسەر خۆیەتی.

٢- دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو.

نەگەیشتن و بۆ یەکدی نەبوونێ، ئەم ویستە خودابیە زۆر و پیرۆزەی لە هێندێك بۆچوونی وەکو دەقی زاڵمەکەماندا، ناڕەوایە؟!

لە وەڵامدا هۆشم پێم دەڵێ: ئەمانە هەر هەموویان ڕاست و دروستن، بەڵام ئەم گەوهەرە پەخشانە شیعرەی (زاڵم)ی باسەکەمان، بەرهەمی گڕ و کڵپەی ئەم عیشقە بۆ یەکدی نەبوونەیە! ئەدی ئەگەر ئەم ئەشقە بەسوێیە نەبووبایە، ئاشقانی گوێگری جوانیویست، بە چی دیکە سەری خۆیان ڕادەژاند و خەمیان پەڕاگەندە دەکردن و ئازاری بەسوێیان هێور و ئارام دەکردنەوە!

خۆ هەر دانەری زاڵمەکەمان، لە نێو گڕی ئەم ئەشقە پیرۆزەیدا نەتواوەتەوە، ئەوەتا حاجی سۆفی مامۆستا مەلا مەحوی شاعیریش، بە سووتانێ ئەشقێکی لەم جۆرەی گیانی، گیانی لە جەستەیدا نەماوە و بۆتە خاك و خاشاك و خۆی لە بیر چۆتەوە و بە خەیاڵ هەر هەمان ڕووداوی لە چەشنی زاڵمەکەمانە، کە بەم بەیتە شیعرەی، ئازاری ناخی خۆی دەربڕیوە، کە دەڵێ:

چ خۆشە ئاگرم تێبەردەدات و پێم دەڵێ یا شێخ!
بە خاشاکی دەوت شوعلە عەسامە دەستی پێدەگرم[1]

---

١- دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو.

## کورته توێژینەوێك لە دەقی زاڵمی باسەکەمان:

لە دەقی پەخشانە شیعری زاڵمیدا، لە بارەی وشەکارییەوە، وەکو دەبیندرێ، هەموو سەرە هەڵوەستەکان بە وشە دەربڕینێ بانگکردنە هاواریانەی "ئەرێ زاڵم، ئای زاڵم، وەرە زاڵم..."، دەست پێدەکەن، جا بە کەمتر یان بە پتربوونەوێ گوتنیان لە گۆرانییەکەیدا، ئەم زاڵمەش نە دەرەبەگێکی چەوسێنەرە، نە فەرمانداریێکی داپڵۆسێنەرە، نە پیاوخەراپێکی ڕێگرە، بەڵکو کیژۆڵێکی گرێدراوی گراویلکەی خۆشەویستی نێو دڵ و بەر دیتەی هەمیشەیی کوڕە لاوی دانەری دەقی پەخشانە شیعری (زاڵم)ییە.

وەکو لە بیر و بۆچووناندا دەردەکەوێ، ئەم دانەرە دەقە، لەبەر هەر هۆیەکی بووبێ، کاری خۆشەویستییەکەی وەکو پێویست بۆ نەگونجاوە. دیارە کوڕەکە وەکو ویست، ڕووی خۆشەویستییە و فەرامۆشییانی لە لایەن کیژۆڵە زاڵمەکەیەکەوە بۆ فەراهەم نەهاتووە، کوڕەکەش دڵی ڕێگەی پێ نەداوە، کە دڵبەرداریيە بهێنێتە کایەوە، چونکە دڵەکان هەردووکیان لە یەکدیدا، یەکدیگیر بوون و یەك دڵی و دوو جەستەییان لێ هاتۆتە بەرهەم و لە یەکدی جوودابوونەوەشیان، دەبێتە کۆتایی ژیانێ، کە ئەوەش بۆ جاحێڵان کارێکی ئەستەمەکارە!

کیژەکە لە بارەی کێشەی کۆمەڵایەتی و مەترسییە قسە و قسەڵۆك و تانە و تەشەری سۆرە و تۆران و، نەنگدارییە و دواڕۆژی مردنێ، زۆر سڵەمیوەتەوە، مەترسییە داك و باب و برایانیشی، مەترسییەکی لە هەموو مەترسییان گەلێك مەترسیداتر بووە.

هەر لەبەر ئەم هۆیە کۆمەڵایەتی و ئایینیانەش بووە، ئەگەر بە ڕێکەوت و هەڵکەوتێکی گونجاو نەبووبێ، زۆر بە کەم و کورتی دیدارسازییەك و ژوانێکی باوەش ئامێزین و گوتەی شیرین گۆڕینەوە و ماچماچێنێ بڕوشکێنیان، بۆ پێك نەهێندراون. جا لەبەر ئەم هۆیانەی مەترسی و کۆمەڵایەتییەوە، گفتوگۆی هەردووکانیان بە هۆی (پوورەپێناو)یوە ئەنجام دراوە، یان هێندێك جاران یەکدی دواندنێك بە هۆی ئامـاژەی دوورەوە، پەیامی پیرۆزی بۆ یەکدیبوونێ نوێ کراوەتەوە، هەر وەکو ئەم شیعرەی گۆرانی ئامێزەی مەجید ئاسنگەری کۆیی، کە لەم بارەوە دڵخۆشییە خۆی دەداتەوە و بە خۆخەڵەتاندنێ دڵی خۆی فەرامۆش دەکا و دەڵی:

تۆ لە دووری، من لە دوورم، بەم جۆرە خۆشە دڵداری
ناچار لە ئەشکم دەبوورم، بێ گرین، بۆشە دڵداری[1]

بە گوێرەی ئەم پەخشانە شیعر و شیعرەش، خۆشەویستییە دوورا و دوور، زۆر بە ئازارە، بەڵام وەکو دەڵێن: ئازارەکەی گەلێك پیرۆزە و ئەنجامەکەشی تامەزرۆییەکی هەنارە مێخۆشییانەیە!

لە خوێندنەوەی دەقەکەیدا، وەکو دەردەکەوێ، هەر چەندە خۆشەویستییەکە یەکدیگرتنێ دوو دڵانە، بەڵام لەبەر ئەو هۆیانەی باسکران، خۆشەویستییەکی بێ ئاکامی هەمیشەیی بووە، هەتا کۆتایی ژیانێ هەردووکیان هاتووە، کاری ئەشقەکەی، هەر بۆ یەکدی سووتان بووە، هەر وەکو مەحوی شاعیری ئەشقی دروست گوتوویەتی:

---

١- گۆرانیی (ئەمیرەکەم)، گوتنی محەممەد دانش، شیعری مەجید ئاسنگەر.

لەسەرخۆچوونە، شەیدابوونە، قوڕپێوانە، سووتانە
هەتا مردن مەحەببەت، ئێشی زۆرە، ڕێزی لێدەگرم[1]

دانەری دەقەکەی، لە کۆپلە سەرەتاییەکەیدا، تەمەنی مێدمنداڵەتییە خۆی و خۆشەویستەکەی دەهێنێتەوە بەرچاوی خۆی، جا ئەگەر بە هەر هۆیەك لە هۆیەکانی دراوسێیەتییەوە، خزمایەتییەوە بووبێ، ئەوە بە یەکدی گەیشتنێك لە ڕێگەی هاتن و ڕۆیشتنی کشتوکاڵ کردنێوە، یەکدیگیر بووبن، لە بن دەوەنێکی، لەبەر سێبەری کەورگێکی نادیار لە چاوی چاودێر و ناپەسەندان، کەمۆکێك پێکەوە دانیشتنێکیان بۆ گوتن و گۆیە پێك هێنابێ و، لەو دانیشتنەشدا کوڕە بە شەرمەوە ڕوانیبێتییە هەر ئەندامێکی جەستەی دڵڕاکێشی جوانی کیژەکەی و خوڕپەی لە دڵی کەوتبێتە پەلەپەلکردنێ و بە شەرمەوە بۆ یەخە و فەریکە هەرمێی کاڵی تازە سەر هەڵدەی باخی ساوا بردبێ! کچەکەش دەستی لەسەر سینەی خۆی دانابێ و نەیهێشتبێ کوڕەکە تێر سەیری باخی بەیان و بەیان بکا و، کوڕەکەش دەستی کێشابێتەوە و داوای زێدەڕۆییانی پتر لە دەست لێدانێ نەکردبێ، کە کیژی زاڵم ئەوەندەی لێ بەرگری کردبێ، دیارە نە کەمتر و نە زۆرتری ڕێگە نەداوە و "مەکە و لاچۆ، دەمانبینن"ی لێ کردبێ بە بێنوێ ڕێگەی نەهێشتنی، کوڕەکەش بە بێ مۆڵەت پەرژینشکێنی نەکردبێ، لەم بارەوە کاکە حەمەی بێڵو (ناری) ئەم حەسرەتەی بە هەناسە هەڵکێشانەوە خەیلێك دروست وێنا کردووە، کە لە بەیتە شیعرێکدا دەڵێ:

---

[1]- دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو.

## ترازا بەندی سوخمەی ئاڵی گوڵناری، بە ئاهی ساردی من
## کەچی دەستی لەسەر دانا، لە سەیری باخ و بەی کردین[1]

دیـارە ئەگـەر کیـژی وابەسـتەی نەریتـە کـۆن و ڕزیـوان داوای کوڕەکـەی ڕەت کردۆتـەوە و مۆڵـەتی نـەداوە، بـەڵام ئەگـەر بیکردبـا، ئەوەندوکـە ویسـتە مەبەستەی کوڕەکـەی هێنابایـە دی، بێگومـان بـۆ هەرووکان دەبوو بە خێری داك و بابان و بەجێهێنانیّ کاری نـاڕەوای پشتا و پشت و یاسای سروشتی بە ئەنجام دەگەیانـد و سێبووری و تەپە و ترپەی دڵی خۆشییان پیّ دابیّ دەکردن و، یادگارێکی شیرینی هەمیشـەییان بـۆ ژیـانی خۆیـان تۆمـار دەکـرد و ئەوەندوکۆکـەش بـۆ هەردووکان نەدەبوو بە کەسەری سەرەمەرگیّ و مردنیّ.

جا هـەر وەکو کوڕەکە لە کۆپلـەی یەکەمـدا هیچ سـەرەداوی ئاواتی پێکگەیشـتنێی بـۆ پێـك نەهێنـدراوە و ماوەیـەکی درێـژیش، بوارەکـانی کۆمەڵایـەتی ڕێگـری ئـاوات بـە دیهێنانـیّ یەکـدی گرتنـیّ هـەردووك دڵان بـوون، خۆشەویستییەکەشـیان هـەر درێـژەی کێشـاوە و پـەرەی پـتر ستاندووە، ئەمجار ناچارانە کوڕەکە بیری لە کۆتایی هاتنیّ ژیانیّ خۆی و بەجێهێشـتنیّ ژیانـیّ خۆشەویسـتەکەی و دۆسـت و برادەرانـی کردووەتـەوە و کەوتووەتـە وەسـیەتکردنیّ بـۆ برادەرەکـانی و، وەکـو ئاشقە سروشتێکیش داوای لێکردوون ئەگەر مرد بەردی بڵندی تیشەی ڕەوەز و سەر لوتکانی بۆ بە کێلی سەرینگان و و پێلینگانیّ، بۆ ئەوەی ئەگەر گۆڕەکەی لە نێو هەموو گۆڕستانەکەیدا دیار بیّ، هەروەها لە پانە

---

[1]- دیـوانی نـاری، کاکـە حەمـەی بێڵـوو، کۆکردنـەوە و سـاغکردنەوە و لەسـەر نووسنی کاکەی فەلاح، چاپی یەکەم، چ(کاکەی فەلاح)، سلێمانی، ١٩٨٤.

زەمینێ لاپاڵی (بەر ڕۆژی) ڕوو لە خۆرێ، بۆ بەردی دیواری گۆڕەکەی بەردانی بۆ بهێنن و بەردێکی پانیشی لەو بەسەرڕاهێشتنێ لە ئاستی سەری دابنێن، هەتا لە ڕاگوزەرێکیدا لە نزیك ئاستی سەرییەوە، هەستی تەپەی پێی دڵدارەکەی ببیستێ و هەناسێکی قووڵی فەرامۆشییە هەڵبکێشێ و بە سەرسوڕمانەوە بڵێ: "هەی عەیامێ بێ ئاکام، ئەی زەمانەی بە جەفا، ئەی زاڵمی بێ وەفا!...".

خوێنەری خۆشەویست، لەبەرئەوەی لە کۆپلەکانی دواتریشدا هەر وەکو کۆپلەکانی پێشوو، باسی ئاواتی ویستراوی ئەشقی دروستی نەهاتووەدی و، وەسیەتکردنێ پێش کۆتایی ژینێ و بە خەیاڵی زیندووبوونەوێ دوای مردنێ نێو گۆڕەکەی و هەستراگرتنێی لە تەپەی پێی خۆشەویستەکەی خۆی، ئەویش هەر ویست و ئاواتێکە وەکو ویست و ئاواتی زیندوویەتییە! دیارە ئەگەر لێدوان لەسەر ئەو کۆپلە دواییانەش بکرێ، هەر باسی مەبەستە ویستە بە ئاخ و ئۆفە بە ئاوات نەگەیشتووەکانی پێشووی دیکە دەبێ، بەڵام ئەوەندە هەیە، ئەگەر چەند وشە و شوێن و ناوی دیکەی نوێی تێدا بەدی دەکرێن.

جا ئەوەی لەسەر هەمووومان پێویستە، ئەمەش ئەو داوایەمان لە خودای مەزن هەبێ، ئەگەر کەسێکی دەبێتە هۆی لە یەکدیکردنێ دوو دڵی یەکدیگرتوو، یا خودا هەرچییەکی ئەگەر دانەرە زاڵم و بێژەرە زاڵم گوتوویانە، گەلێك پتر و پتری بەسەر بێ! چونکە وەکو لە شوێنێکی دیکەدا گوتوومانە، خۆشەویستییەتی، کارێکی پیرۆزی خودایی و، مێژوویی و، دروستی و، یاسایی دیاری مەزنی مەزنانە و نوێبوونەوەی و پێشکەوتنێ مرۆڤایەتییە جیهانێیە.

لەم ڕووەوە ئەحمەد هەردی، خۆشەویستیی بەرزەباڵا نرخاندووە، کە گوتوویەتی:

هەر بە تەنیا خۆشەویستی شك ئەبەم ست فاتمە
سەروەتم ناویٚ بزەی تۆ، ئەوپەڕی ئاواتمە
خۆشەویستیی وا، کە نامەی خوایە بۆ پێغەمبەران
بەرز و ناسك وەك هەناسەی، پڕ گوڵاوی دولبەران[1]

ئەخۆڵیش دەڵێ:

شەرتە یا حەسرەت لەگەڵ خۆمان ئەنێمە قەبرەوە
یا ئەبێ بمرم، لە خونچەی نەوشکوفتەی لێوی یار[2]

---

١- ڕازی تەنیایی، سەرچاوەی پێشوو.

٢- دیوانی ئەخۆل، (ئەحمەد دەروێش عەبدوڵڵا)، بەغدا، چ(ئەدیب)،١٩٨٤،

## له نێوانێ مەحوی شاعیر و دانەری دەقی زاڵمیدا :

دیارم دەیری عیشقە، جێ بە سووتن بێ لەوێ دەمرم
کە من مشتێ چڵ و چێوم، بە چی بم کەڵکی کێ دەگرم![1]

ئەم تاکە شیعرە، سەرەتای دیارترین شیعرە لەم جۆرە شیعرانەی مەحوی، چونکە لە خوێندنەوەی نێو دیوانەکەی و بەکارهێنانێ دەرێشدا، وەکو گۆرانی لێکدانەوەش پتر لە شیعرەکانی دیکەی ئەم شاعیرە لەسەر زمانان و لە نێو گوێیان و لەبەر چاوان، دەگوترێ و دەبیسترێ و دەدیترێ.

تێکڕای ژمارەی تاکەکانی ئەم شیعرەی، نۆ تاکە شیعرە، کە بە شیعری سەرەوە دەست پێدەکات و بە شیعری "شوکر هوشیارە مەحوی..." کۆتایی دێت.

ئەمن لێرەدا تەنیا مەبەستم ئەم تاکە شیعرەیە:

چ شۆخە ئاگرم تێبەردەدات و پێم دەڵێ یا شێخ!
بە خاشاکی دەوت شوعلە عەسامە دەستی پێدەگرم

مانای گشتیی شیعرەکە ئەوە دەگەیەنێ، کە لێرەدا مەحوی خۆی لە بیر چووەتەوە، کە ئەو کەسێکی بەرجەستە و کەسایەتی و دیارە، بەڵکو لەم شیعرەیدا کەوتۆتە نێو دەریای پان و قووڵ و مەندی خەیاڵانەوە و لەبەر خۆیەوە وڕێنان دەکا و دەڵێ: ئەمە چۆن گاڵتەپێکردنێکە، کە ئەم ئەشقە دروستە، بە منی دەکا و پێم

---

١- دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو.

ڕادەبـوێریٚ! ئـەوەتا دەمسـووتێنیٚ و لـە کـاتی سـووتاندنەکەشمدا، بەرابـەرم ڕاوەسـتاوە، هـەر وەکـو هێـز و توانـای خـۆیم نیشـان بدا، بـە لەخۆباییبوونـەوە سـەرکەوتووانە پـێم دەڵـێ: ئـەی ئاشـقی بەتـەمـەن و پیری ڕێـزداری خـاوەن بـاوەڕی ڕێبـواری ڕێگـەی مەترسـیدار و دووری ئەشقی ڕەوا! ئەمن سوێند بە سەرجەمی ئەو دەمـار و گۆشـت و ئێسك و پێستە سووتاوە و چڵ و چێوە هەڵقرچاوانەت دەخۆم، کە لـە ئاگری جەسـتەی سـووتاوت بـەجێماون، ڕووناکـایی ئـەو ئـاگرە سـووتێنەرە ڕووناکیدەری بەرچاوی ڕێگەی لەسـەر ڕۆیشـتنیٚ منـە و لـە ژیانیشـمدا وەکـو داردەسـت دەسـتی پێـدەگرم و ڕێـی پـیٚ دەبـڕم، دیـارە ئـەو ڕووناکاییەش (شوعلە) ڕووناکی بڵێسەی ئاگری ئەشقی خوای مەزنە! هـەر وەکو لـە قورئانێـدا هـاتووە: "وَلِلَّـهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَإِلَـى اللَّهِ الْمَصِيرُ"[١]. هەر چەندە مەحوی وەکو جەستە زیندووە، بەڵام وەکو بیر و هۆش، بێ ئاگایە لە خـۆی و لـە ئەشـقی خودایـدا تواوەتـەوە، کـە بە عەرەبی پێی دەگوتریٚ (الفناء في الله).

هەر وەکو گوتومانـە، لـەم شیعرەیدا ئەشـقی خۆشەویسـتییە خـوای مـەزن، ئاگر لـە جەسـتەی مـەحوی بـەردەدات و دەیسـووتێنیٚ و شـیی دەکاتەوە بۆ هەموو ئەو بابەتە پێکهاتانەی، کە لێی پێك هاتووە، گیـان (ڕوح)ە گوناهبارەکەی، دووکەڵە ڕەشەکەیە (دەو)، کە بۆ کڕنۆش بردن و پاڕانـەویٚ لێخۆشبوونیٚ، گوناهـان بـۆ بـەر بارەگـای خـودای گـەورە بەرز دەبێتەوە و سەرەی چاوەڕوانییە لێبووردنیٚ سۆز و میهرەبانییە لـە خـودای خـۆی دەکـات، بـەڵام چـڵ و چـێوە سـووتاوەکەی، کـە لـە

---

١- سووڕەتی نوور، ئایەتی ٤٢.

سـووتانیَ جەسـتە و دووکەڵەکـەی بـەجێماوە و لـە گوناهـان پـاك بووەتـەوە و کەوتووەتـەوە سـەوزەییە و دەبێتـەوە بـەو خاکـەی لێـی دروست بووە، دیار و ڕوونە، کە کۆتایی هاتنیَ هەموو جۆرەکانی ژیانـیَ، بـە کۆتـایی ئـەمجۆرە کۆتاییهاتنـەی ژیانـیَ مەحویشـەوە، گەڕانەوەیە بۆ ئەو زەوییە زاوەی داکیَ هەموانمانە، کە ئەمەش ئایەتی قورئانی "انا لله وانا الیه راجعون "[1].

لە دەقی پەخشانە شیعری (زاڵم)یشدا، دانەر خودی خۆی لەبیر چۆتەوە و بە خەیاڵ مردووە و، جارێکی دیکەش هەر بە خەیاڵ و خۆ لەبیرچوونەویَ، دیسـان زینـدوو بووەتـەوە و بـە نەخۆشـییەکی دەردگرانی مردنیَ نەخۆشە و کەوتووەتە وەسیەتکردنیَ، بۆ ئەو کەس و برادەرانەی کە دەینێژن.

وەکو دیارە مەحوی شاعیر و، دانەری دەقی زاڵمی، هەردووکیان گیانسپاردەی دەردی ئەشقن، بەڵام هەریەکەیان بە جۆرە ئەشقێکی دروستی و خوازەیی. بێگومان سەرەنجامی هەردووك مردنەکەش، هەر گەڕانەوەیە بۆ نێو هەناوی زەوی و بارەگای مەزنی مەزنان. مردن بە هەر هۆیەکەوە و بە هەر جۆرێکی بێت، هەر مردنە، شاعیرێکی عەرەبیش لەم بارەیەوە جوانی گوتووە:

من لم یمت بالسیف مات بغیره     تعددت الاسباب والموت واحد[2]

---

١- سوورەتی البقرة، ئایەتی ١٥٦.

٢- سەرچاوە: نووسەر خۆی لە گەنجییەوە لەبەری کردووە.

# ئازیزەکەی عەلی کەرداری[1]

ئای ئای ئازیزێ دە وەرە ئازیزە گوڵی،
کەس نەبوو پرسیارێکی بکا، لە دڵی منی کۆستکەوتەی ڕەبەنەماڵێ
ئەوە ڕاناوەستێ لەبەر ئەوێ غەمێ، لەبەر ئەوێ ژانە ژانێ
لە هەموو کەسم ئازیزتری، ئازیزێ، ئازیزە گوڵێ.

***

ئای ئای دە وەرە ئازیزێ...
فرمێسکم، لە خورەمی بارانەی بەهارێ لە جۆشتزن
هەناسەم، لە منداڵی بێ داك و باب گەلێك ساردترن،
کیژێ پانییەت لە هەنجیرە زەردەی ژەنگارێ خڕترن
بەژن و ڕاوەست و هەڵوەستەت، لە داری عودێ ڕاستترن
سینگ و بەرۆکت[2]، لە کاغەزی مەرجانی سپیترن
باخەڵ و بەرباخەڵت، لە وەتاغی عەجەمی خۆشترن
جووتە مەمکت، لە لیمۆی سەر دووکانی شاران بە ڕەنەقترن
گەردن و لاگەردنت[3]، لە بلووری ئینگلیسیسافترن
چەنە و ژێر چەنەت[4]، لە سێوی زێڕین زێڕینترن

---

١- سەرچاوە: عەلی کەرداری خۆرهەڵاتی کوردستانێ- موکریان، کاسێت. هەروەها عوسمان ئەفشینی سابلاغی، بۆ زانینی شوێنەکان.

٢- بەرۆك: بەر ئەوك، بەر گەردن، ژێر گەردن.

٣- لا گەردن: لا مل.

٤- ژێر چەنە: بن چەناگە، غەبغەب، شێخ ڕەزای تاڵەبانی لە شیعری دلبەرانی کۆیەدا دەڵێ:

حەکاکان[1] بێنن، دە دم و ددانی ئەوێ کەڵەمەرجانێ فکرن
ئازیز ددانت، لە دوڕی بەحران سپیترن
کەپۆت، لە فندقی جوانتر و
هەنیەت لە شەمی کافووریێ سپیترن
لێوت، لە پەڕەی سوورە گوڵان سوورترن
ڕوومەتت، لە سێوی سەر لکان لە باغەوانی یاغیترن
چاوت، لە ئەستێرەی ڕۆژێ و،
نێوچاوانت، لە مانگی چواردە و پازدان
گەلێک گەلێک گەشترن،
زوڵفت، لە ئاوریشمی خاسە ڕەنگی سەر دوکانان خاوترن
دە وەرە ئازیزێ، ماڵێ من و ماڵێ بابی منت لەبەر مرن، ئازیزە گوڵێ.

***

ئای ئای ئازیزێ، ئازیزە گوڵێ
چاوت بە من بمێنێ، بە چاوی بازی
برۆت بە من بمێنێ، بە پەڕی دە سەقەری.
کیژ دەیگوت: ئەمن تەیر و توارم لە کوێ بە چاو دەنگاوتن؟!
لە سیڕێزە و ڕەشبەڵەکان،[2]
هەڵدەکشانەوە بۆ زیارەتی پیر خدری[1]

---

سێوی داناوە لە ژێر لێو، کە ئەمەم گۆی زەقەنە
زیوە خڕ کردووە وەك گۆ، کە ئەمیشم غەبغەبەم

١- حەکاك: ئەو زێڕکارانەی، کە بە هۆی ئامێرێکیەوە (حەککاك) چاك و خەراپ و پلەکانی زێڕی پێ وە دەردەخەن، وشەکە عەرەبییە و کوردێندراوە.

٢- سیڕێزە و ڕەشبەڵەك: گۆڕایی (مەیدان)ن، دەکەونە نێوانێ سابلاخ و پیرانێ.

کیژ دەیگوت: تەیر و ترومپام لە کوێ بە چاو دەنگاوتن
لە تیرۆژ و ڕەشبەڵەکان،
هەڵدەکشانەوە دەچوونەوە زیارەتی پیر خدری.
ئەوە هەتیوە لاوە، ماڵێ بابەکەی منت لەبەر مری
ئەمن دەمرم لەبەر ئەوان جوان و جحێڵان، شەنگە جحێڵان
ئەگەر هەموو ئێوارە و سبحەینان، سواری عەلەمبەهاری[2] خۆیان دەبن و
هەر کەس ڕێیە بە جێ لە گراویلکەی خۆی دەگری.
کیژ دەڵێ: ئەگەر ئەمن لەبەر خۆفێ خودای و تانەی عەبدان بوێرم
خۆمت لێ باوێمە کوڵێ حەسارێ،
زوڵفت لێ سێبەنگی کەم[3]
گەردنێ خۆم هەڵێنم و سیخدری[4] باوێمەوە تەپڵی سەری و

---

١- پیر خدر: ئارامگای شەخسێکە یان پیاوچاکێکی کوردە، دەکەوێتە نێوان شارەکانی سنە - کرماشان و پاوە - ڕەوانسەر، لە خۆرهەڵاتی کوردستان، وە لەوێش دەکەوێتە سەر چیایەك کە هەر بەو ناوەوە ناسراوە لە پەنا چیای شاهۆ(ئنستیتیوت)

٢- عەلەمبەهار: وڵاخەبەرزەی تایبەت بە سوارییە، وەکو ئەسپ و ماینێ زێدە چاك، لە کاتی غاردانێدا کلك بڵند و سوار بڵند و گەردن بڵند دیارن.

٣- سێبەنگ: زوڵفت بە سێ بەشە تاڵە زوڵف، بۆ بهۆنمەوە.

٤- سیخدر: لە کۆندا پیاوی سوارچاکی شەڕان، جۆرە کڵاوێکیان لەسەری خۆیان کردووە، کە پەڕی باز و شەهێنیان تێچەقاندووە، هەر وەکو عەلی بەردەشانی دەڵی:

حەیفە سەلیم بەگ بمرێ　　　پەڕ بەسەرە، مل بە زرێ

وێدەچێ ئەگەر سیخدریش کڵاوێکی لەم جۆرە کڵاوانە بووبێ، بەلام بە پەڕی جوانی ڕەنگینی وەکو بولبول و کەنارییان، بۆ کڵاوی ژنان ڕازێندرابێتەوە. دیارە

دوگمەی بەرۆکم بترازێنم و
جووتێکت زەرمەمکان نیشان دەم
لەوانەیە کافرت کەم و لە ئۆمەتی موحەمەدیت بکەم بێبەری!
دە وەرە ئازیز...

***

کوڕ دەڵێ: یاری من تەیرێکی دامێن بە خوناوکە و،
هەڵدەفڕی بۆ چۆمی دە سیادەری[1]
ئەو مەخلوقاتی دە سەر چۆمی سیادەریە
کەس بە بابییەوە ڕێی ناکەوێ
عەیبێکی لە بەژنێ باریك و دوو چاوێ بەڵەك بگری.
کیژ دەڵێ: دەك ڕەبی خودایە هەر کەسێکی عەیب و ئیرادێ
لە منی جوانی سادە و ساکاری بێ پەڵە دەگری
خوداگیری من بێ، ڕۆژبازاڕی قیامەتێ،
ببێ بە پرد و بۆ خۆم بەسەردا ڕابپڕی.
هەتیوە لاوە لەبەر خۆفێ خودای ئەتۆ وەرە
ماچێك و بیست و دوو شەو ڕامووسانم
لە گەردنێ بە خاڵ و ناسکەی ڕوومەتێ
دوو چاوی بەڵەك بکە
بەڵکو گولەکەی گولەمێردان، لە کەلێنێکی چاوی لێ بێ و
حەوت ساڵانی ڕەشە دەرد لە بن پەراسوویدا خڕ ببێ و

---

ئەگەر وشەی (سیخ)یش پەیوەندی بە جەستە و پەڕی باڵدارانەوەیە، چونکی ڕەگی پەڕانیش لە جەستەی باڵداراندا، پێی دەگوترێ (سیخ).

١- سیادەر: چۆمی گادەری، دەکەوێتە دەڤەری سەقز.

پاشی حەوت ساڵەی، لێی بکاتە ڕەقە بێوەی سیری[1]

دەردی گران ببێ و لە کن خودای و پێغەمبەران

بەڵکو لە حەیفێ ئەوێ قسێ بمری!

دە وەرە ئازیزێ، ئازیزە گوڵێ،

ئەتۆ لە گوڵان گوڵتری، لە ڕێحانان بۆنخۆشتری، ئازیزێ!

ئای لە من ئازیز... لە ئێوەش ئازیز...

---

١- ڕەقە بێ وەسیری: وێدەچێ ئەم دەردەگرانە، شێرپەنجەی ئێسکی بووبێ.

## تروسكێك لەسەر بەشە ئازیزەكەی عەلی كەردار:

وەكو گشت پەخشانە شیعری ئازیزەی ئازیز، هەتا ڕاددێكی بەرچاوی زاندراو، بابەتێكە بۆ گۆانی گوتنێ، گەلێك درێژ و بە لك و پۆپ و كۆپلە كۆپلەی هەمەجۆر و لایەنە باس لە یەكدی جودایە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ئەگەر ئازیزەبێژەكان، بۆ چڕینێ، كۆپلەبژێرییان تێدا كردووە و بە دەنگە خۆشەكانیان، خەمی نێو دڵی خۆیان وەدەرناون و بە بەر ڕەشەبای تیژڕەویان داون.

بە هۆی كۆپلەی نێوەڕۆك لە یەكدی جوداشەوە، ئاوازەكان جوداییان بەسەردا هاتووە، بەڵام لە یەكدی نزیكی بابەتە كۆپلەكانی و ڕەگی داكوتراوی نێو زەوینێ مێژووی ئازیزەی و یەكدەقیی داندراوەكەی، نەیانهێشتووە لە یەكدی ترازانێ ئاوازەكانی، لە ئاوازە ڕەسەنەكەی، زۆر لە یەكدی دوور بكەونەوە و نەناسرێنەوە.

وەكو دەبیندرێ و دەبیسترێ، هەر چەندە دەقەكە زۆر بڵاوە، بەڵام گەلێك مانادارە و ڕستە و دەستەواژە و نێوەڕۆك بەهێز و سۆزدار و هەستبزوێن و فەرامۆشهێن و نموونەی ڕەسەنی فۆلكلۆری كوردییە و لەسەرینێوە هەتا پێینێ، تێكڕا هەر هەمووی بەچكاوە و تك لە دوای تكێ، جوانیاوی ڕوون و زێدە خاوێنی لێ دەچۆڕێتە نێو بیر و هۆشی جوانپەرستان و خۆشیویست و خۆشویستراوان.

لە كاتێكدا، كە وشە و ئاوازی دەنگەكانی زمان و بلوێرێ، ئاوێتەی یەكدی دەبن و وە دەنگ دێن، جۆش و خرۆشێكی نایاب بەرپا دەكەن و سەران بە گوێدێران ڕادەژێنن و وەكو هەنگی تینوو، لە دەوری ئازیزەی

دەنیشنەوە و تاسوقانە دەمیان بە تکاوەی شیرینەوە دەنێن و پۆل لـە دوای پۆلان دێن و فەرامۆشیان وەردەگرن و وەردەگرنەوە و دێن و دەڕۆن.

وەکو دیارە لەم بەشە ئازیزەیدا، لە هەوەڵێوە ئازیزەبێژی گۆیندەی ئـەم دەقـە ئـازیزەی باسـەکەمان، زێـدە خـەمبارە و هـەر چـوار هـۆدەی دڵەکـەی، وە بـن لیتـەی خـەمان کـەوتوون، دڵدەرەوێکیشـی نییـە هـەتا دڵخۆشـییەی بداتـەوە و خەمـەکانی لـێ وەدوور بخاتـەوە و کـەم و زۆرێك، ژار و ژانێی هێور بکاتەوە و ئارامییـەکی پـێ ببەخشـێ و گیـان و جەستەی ژێر باری خەمانی، ئاسوودە بکات.

پێشینان گوتوویانـە: فرمێسك ئارامبەخشـی ژیانـە. ئازیزەبێـژیش، هـەتا دەتوانـێ و بـۆی دەکـرێ، لەگـەڵ هەڵڕشـتنێ فرمێسـکە بـە خوڕەکانی، خەمی پەندخواردووی نێو دڵەکەی وەدەردەنێ و تێکەڵەی خەم و فرمێسکەکانیشی، لە ڕێژنە بارانـە سـەر بـەکڵاوەی بـەهارێ، بە لەجۆشتر دەنوێنێ!

ئـەم پارچـە ئـازیزە، بـە گوێرەی سـەروایەکانی، بریتییـە لـە دوو کۆپلـەی قـەوارە ڕسـتەی ناوەنـدی زێـدە قەشـەنگ، کـە کۆپلـەی یەکـەمیان بـەراوردی بەشێك لـە ئەندامـەکانی جەسـتەی خۆشەویسـتەکەیەتی لـە جوانییەتییـەدا، بـە بەرابەرایەتییـە جوانییـە، دیـاردە سروشـتییەکان و چـەند جوانییـەکی دیکەی مرۆڤکردی وەکو شەمی کافور و بلووری ئینگلیزی و...هتد.

لـەم بەرابـەری و بە یەکدی گرتنەشـدا، جوانییەتییـە مرۆڤان زۆر وەسـەر جوانییەتییـە هـەموو جـۆرە جوانییـە سروشـتییەکان کـەوتووە، دیـارە مرۆڤیش بەشێکی گرنگی سروشتە و لێوەشـاوەترینی ئافەریـدە ئافەریـدەی کردگـار و پەروەردگارییـە. جـا لەبەرئـەوەی هـەر هەبوویـەك، کـە خـۆی لـە مرۆڤان بە جوانتر و مەزنتر ڕابنی، بێگومان کارێکی نادروست و نابەجێیە!

لــه کۆپلــەی دووەمیشـــدا، ســـەروایەکان دەگـــۆڕدرێن، بڕگـــە و هەڵوەســتەکان پـتر و پـتر دەبـن و ڕسـتەکانیش درێـژتر. بەرابـەر بـە یەکدی گرتنەکەش بەرەو کەمبوونـەوێ و نـەمانێ دەچن، مرۆڤیش لـە جوانییەتییـەدا هـەر بـەهادار و تـاك و دیـار و گەشـە و، شـانازییان بـە زێدە جوانییە خواپێداوەکانی خۆیەوە پتر وەدەردەخا. دیارە ئەگەر بـە هـۆی ئـەم بەخشـش و ڕێـزەی خـودای مەزنیشـەوە، خەمـەکانی ئازیزەبێژی، لە نێو دڵە خەماوییەکەیدا وەدەر دەنـدرێن و سـەرگەردان دەبن و لێی وەدوور دەکەونەوە.

لـەم بەشـە کۆپلەیـدا بـە ڕوونـی دیـارە، ئەگـەر کیـژێ باسـەکەمان بـە زۆرداری و هـــەر وەکـــو دەڵـــێن "بـــە زەبـــری خەنجـــەرێ" لـــە خۆشەویستەکەی هـەڵبڕدراوە و بـە زۆری و بـە نابەدڵییـە خـۆی، دراوە بە پیاوێکی ناحەزی نەویستراوی چارەبەد، بەڵگەش بۆ ئەم ڕاستییەی ئەوەیە، کچەکە بە کوڕە لاوە خۆشەویستەکەی نێو دڵـی خـۆی دەڵـی: ئەوشـۆ مێردەگولـەم لـە ماڵـێ نییـە، ئـەتۆ وەرە دەسـتەملانم ببـە و ئامێزێم تێوەرێنە و ماچم بکە، بەڵکو پیاوەکەم لە بێدەسەڵاتییان و لـە خەفەتان، لـە نێو ئـاپۆرەی خەمانـدا تووشـی نەخۆشـییەکی کوشـندە ببێ و، خودا و پێغەمبەر تۆڵەی بۆ یەکدی نـەبوونێ ئـەمن و تـۆی لـێ بکاتـەوە و دەردی گرانـی گرانتر و گرانتر بکـەن و کۆتاییـەی بە ژیانـێ بهێنن و ئەمن و ئەتۆش بە یەکدی شاد ببین. ئێمـەش دەڵێین پیرۆزە و ئەم شیعرە بەرزەی مەلا مەحموودی بێخودیشتان پێشکەش دەکەین:

لـە ئەسـبابی فـەرەح سـاڵۆنی بـەزمت پـڕ تـەدارەك بـێ
شـەوت هـەر ڕۆژ و، ڕۆژت جـەژنت لـێ موبـارەك بـێ

# شلەخەجێ

ئەرێ خەجێ خاڵ شینێ، تەخودا دڵەکەم مەشکێنە
ئەرێ خەجێ خاڵ سینێ، بە ناحەق مەمرەنجێنە

فۆلکلۆر

## چەندم پێ گوتی شلەخەجێ[1]

چەندەم پێ گوتی شلەخەجێ، مەچۆ بیتوێنێ
ئاوی ناسازە شلەخەجێ، نۆبەتێت دێنێ
بە قسێت نەکردم شلەخەجێ، ئاخیری هەر چووی
ئێستێکەش چ بکەم شلەخەجێ، سێبەڕۆی گرتووی[2]؟!
کەپرێکت بۆ بکەم شلەخەجێ، لە قولەی دەربەندی[3]
دێمە کن داکێت بە زاوابەندی[4]، هاوینێ نەمرم شلەخەجێ

---

١- شلەخەجێ: ناسکە خەجێ، شلکە خەجێ، نەونەمام باڵاخەجێ.

٢- سێبەڕۆ: سێبەڕۆژ، بە سێ ڕۆژان ڕۆژێك، نەخۆشییەکی وەکو مەلاریا و گرانەتا، کە لە ئێستێدا ناوی نەماوە، وێدەچێ ئەگەر لە ئەنجامی گەرما و هەتاوی زۆرەوە خەڵك تووشی ئەم نەخۆشییەی بووبن، ئەوەش بە بەڵگەی گەڵای داری بی، یان پرپرە (پەڵپینە)، یان پنگیان لەنێو دۆی شەوی دەکرد و بە نەخۆشیاندا دەکرد و بۆ ماوەیەك دایاندەپۆشی لە دواییدا نەخۆشەکەیان دەشووشووشتەوە و چاك دەبووەوە.

٣- قولەی دەربەندی: ئاوێکی هەڵقوڵاوی هەمیشەییە لە ڕۆخی خۆراوای دەربەندی بیتوێن- پشدەر لەسەر زێی بچووك (بە بەری چیای کێوەڕەش).

٤- زاوابەندی: ماڵێك کچێك لە کوڕێك مارە دەکەن، بە مەرجێ ئەوەی کوڕەکە لە ماڵێ داك یا بابی کچەکەیدا بژی و ببێ بە کوڕی ماڵێ بابی کچەکەی و بە دڵسۆزی هەر وەکو

ئەرزە ڕەقانە، پاییزێ نەمرم شلەخەجێ
گەلاڕێزانە، بەهارێ نەمرم شلەخەجێ
فەسڵی گوڵانە، ئەو وەختەی بمرم شلەخەجێ
دەست لێکبەردانە!

***

بیتوێن[1]، دەڤەرێکی پان و بەرینە. دەڤەرێکە، پشتی چیا و بەری دەشتە. خۆرهەلاتی، زێی بچووك و دەشتی (بەری مەرگێ)یە، خۆراوای، دەڤەری خۆشی بە چیا و دۆڵ و ڕەز و باخی خۆشناوەتییەیە، لای ژێرووشی، (گۆماوی دوکانێ)یە.

---

ئەندامێکی خێزانەکەیان کارکردە بێ. وە لە شیعرەکەشدا دەردەکەوێ شلەخەجێ کچێکی بێ باب و برا بووبێ و هەر لەگەڵ داکێی دوو بە دوو پێکەوە ژیانیان بەسەر بردبێ، لە چەند دەڤەرێکیش بەم جۆرە زاوایە دەگووترێ (زاواڕێوی).

١- بیتوێن، وێدەچێ ئەگەرچی یەکەم پیتی وشەکە پیتی (ب)یە، وەکو ڕاستی پیتی (پ) بێت و وشەکە لە بنەچەدا (پیتیوێن) بوو بێت، کە بەمجۆرەی وشەکە بابەتییانە لەگەڵ خاك و ئاو و هەوا و بەرهەمی زۆر و جۆراوجۆری دەڤەری پیتوێنێ دێتەوە. لەو ڕۆژەوە، کە عەرەب کوردستانیان داگیر کردووە،، وشەی پیتوێن بووە بە وشەی بیتوێن،، ئەمەش لەبەر پیتی (پ) کە لە زمانی عارەباندا نییە.

وشەی پیتوێن، ناوێکی لێکدراوە لە دوو وشە ناوی تاك پێکهاتووە (پیت+وێن) بە مانای جێی بە پیت. دیارە لە زمانی کوردیشدا لەم جۆرە وشانە، وەکو وشەکانی (دژوێن) جێگای دژ، (بژوێن) شوێنی کشتوکاڵ و جێگای ژیان، (ڕەقێن) جێی ڕەق، (گەرمێن) جێی گەرم و زۆر وشەی دیکەش.

بیتوێن، خاکێکی نەرمی لیتەیی زێدە بەبڕشتی بە بەرهەمی هەیە بێ لەوەش، ڕووبار و قولە و کانیاوی گەلێك زۆرە و هەمیشەیی و بەردەوامن، ئەم ئاوە زۆرانەش، وەکو دەماری خوێنی زیندەگییە جەستەی خاکەکەیان بە پیت و بەرهەمی جۆراوجۆر و زۆر، هەموو دەمان هەر گەنج و گەنجتر و ڕازاوەتر دەکەنەوە و دەکەنەوە.

ئەم خاکە، بێجگە لە بەرهەمی کشتوکاڵی دەشتایی بە پیتی، چیایەکانیشی بە لێڕەواری خۆڕسکی سروشتی ڕازاوتەوە، دیارە دەشتی فراوان و چیای بڵند و بە دۆڵ و شیویش، هەر لە کۆنەوە هەتا ئێستێش، بوون بە پاوانی زەنوێری بەخێوکردنی جۆرەها ئاژەڵیماڵی وەکو مەڕ و بزن و گا و گامێش و وڵاخەبەرزە، ئەوە بێجگە لە گیاندار و باڵداری کێوی، بە هۆی ئاوی گۆماوی دوکانیشەوە، سامانی ماسی زۆر، بووەتە بەرهەمی بژێوی بەشێکی دانیشتوانی دەڤەرەکە خۆی و دەڤەرەکانی دیکەش.

دیارە ئەگەر ئەم دەڤەرە، دەڤەرێکی گەلێك بژوێن و بژیەنە، پشتیوانێکی گەورەی ڕزگاربوونێ نەتەوەیە بۆ سالانی نەهاتی و نەداری و نەبوونییە، جا لەبەر ئەوەش کە بیتوێن ئەم جۆرە دەڤەرە بە بەرهەمەیە، گەلێك سالان خەڵکی بە کۆی خێزانەکانیانەوە، ڕوویان لەم دەڤەرە بە پیتەی کردووە و بۆ کشتوکاڵکردنێ و، خۆیان پێ لە نەداری و هەژاری و نەبوونییە ڕزگار و بێدەربەست کردووە.

دیارە ئەم خاکە بە پیت و هەمیشە زەنوێرەی کشتوکاڵ و مەرەزە و پووش و پاوان و قامیش و زەل و...هتد، هەمیشە شوێنی حەوانەوە و گەشەکردنێ مێشوولەی مەلاریا و میکرۆبی گرانەتایان بووە، وە لەبەر ئەوەی لە کۆنیشدا دەرمانی ئەم نەخۆشییانە نەبوون، یان زۆر

بە کەمی هەبوون، ئەم میکرۆب و مێشوولانە، بوون بە هۆی ئەم دوو جۆرە نەخۆشییانە و ئیدیکەی خەڵکی بیتوێنی.

وەکو لە شیعرەکەشدا دیارە، ماڵی خەجێش هەر لە گوندەکانی دەوروبەری دەڤەری نزیکی بیتوێنی بووە و لەبەر کەم دەرامەتییە، بۆ بژێوییە خۆیان ڕوویان لەم شوێنە بە پیتەی کردووە و خەجێی ماندووی کارانیش، تووشی نەخۆشییەکی لەم نەخۆشییانە بووە و پێوەی ناڵاندووە و بێچارە کەوتۆتە نێو نوێنی نەخۆشییە، دەردی بێ دەرمانەوە، کوڕە لاوە دڵگیرەکەشی، کە بەم نەخۆشییەی زانیوە، زۆری خەفەت بۆ خواردوون و گەلێکیشی بیر لێکردوونەوە، ئەگەر چارێکی بۆ بدۆزێتەوە، بەڵام بێجگە لە دڵسووتانەوە و پەرۆشیان، هیچی دیکەی پێ نەکراوە.

دواجار ئەوەی بە بیردا هاتووە بچێتە کن داکێ خەجێ و داوای لێ بکا کە خەجێی بداتێ و ببێ بە ڕێنجبەریان و بچێتە سەر ماڵۆچکەکەیان و لەم ڕووەیەوە خزمەتی خەجێ بکات و ببێت بە کەسێکی مەحرەم و مێری خەجێ و پیاوی هەڵسوڕاوی کاروباری ماڵێ، بەم کارەش دەگوترێ (زاوابەندی- زاواڕە).

جا بۆ ئەوەی خەجێ لە ئاووهەوای بیتوێنێ وە دوور بکەوێتەوە، کوڕە لاوەکە لەسەر کانییە ئاوەکەی قولەی دەری دەربەندی، لە ڕۆخی زێیە، کەپرێکی خنجیلەی بۆ پێك هێناون و ماڵی بۆ بردوونە ئەوێ و کەوتوتووەتە خزمەتکردنێ خەجێ و شەوانەش لەسەر کەپرێ لەبەر هەوای فێنکی شەوانە، دەستەملانێیە خەجێی کردووە و بە قسەی خۆش دڵخۆشیی داوەتەوە و پێی گوتووە: خەجەکەم، خەجە گیان، ئەگەر خوا نەکردە هیچت لێ بەسەرهات، ئەمن لە دوای تۆ کۆتایی بە

ژیانێم دێنم. جا کوڕە لاوەکە هەست و دڵسۆزی و خۆشەویستییە خۆی بەم شیعر و گۆرانییەی دەربڕیوە.

بێگومان لەو سەردەمەشەوە هەتا ئێستێ، گۆرانییەکە، بە هۆی بەهێزی خۆیەوە، خۆی لە نەمانێ پاراستووە، خەڵکی لە یەکدییان وەرگرتووە و گۆرانیبێژ و دەنگخۆشەکانیش هەمیشە چڕیویانە و فەرامۆشییە دڵی خۆیان پێ ساز و گەش و گەشتر کردووە.

وەکو دەبینردێ شیعرەکە سادەیە و لە دەروونەوە هەڵقوڵاوە و چیرۆکئامێزێکی ڕیزبەند و پەیوەندیدارە، سەرەتا و نێوەرۆك و کۆتایی، وەستایانە داڕێژراوە. بەشی یەکەمی، بە بیرهێنانەوە ئامۆژگاری کردنێیە لە لایەن کوڕەکەیەوە بۆ خەجێ، ئەگەر نەچێ بۆ بیتوێنێ. بەشی دووەمیشی نەخۆش کەوتنێ خەجێیە و بەشی سێیەمیشی چارەسەرکردن و دڵسۆزی دەربڕین و دڵدانەوەی کوڕەکەیە، بۆ فەرامۆشییە کچەکەی، هەر لەبەر ئەوەشە کەپرێکی لەسەر کانییە قولەی سەر کەناری زێیە دەربەندی نێوانێ بیتوێنی و پشدەرێ بۆ دەکات، کە ئاوێ ئەو کانییەش، ئاوێ زوڵاڵێ چیای قەندیلییە.

دیارە کات بریتییە لە چوار وەرز، کوڕەکەش لەبەر دڵخۆشیدانەوێ خەجێ، نایەوێ لە هیچ وەرزێکی لەم وەرزانەدا بمرێ و خەجێ بەجێ بێڵێ، بەڵام ئەگەر خوانەکردە خەجێ لە هەر وەرزێکدا کۆچی دوایی کرد، دەست لە یەکدی بەردان، دروست دەبێ، ئەو کاتەش کوڕەکە، بۆ نەژیان لە دوای خەجێ و بۆ پێگەیشتنێی، مردنێ خۆی لە خودای داوا دەکات.

# سەحەر

مەگەر تۆ ئەی گەلاوێژ، ئەی بزەی لێوی سەحەرگاهان
مەگەر تۆ بسرەوێنی قوڵپی ئێشی قەلبی بی سامان
گۆران

ئەوەل سەحەرە،
سەحەر سەدایە منی غەریبە، ماڵێ وەرگێڕم
ئەگەر فەقێیان لە مەدرەسان دەخوینن،
وە من بە بێ برین خوێنێ دەڕێژم
گەلی برادەرینە،
وە من هەر چەندی دەکەم لەوێ کۆنە دنیایێ
قاسیدەکی بە متمانم دەست ناکەوێ
ئەگەر بینێرمە بەژنێ باریك و دوو چاوی بەڵەك
ڕاستیێ دڵێ خۆمی لە بۆ ببێژم
وەیلێ، سەحەرە...

***

ئەوەل سەحەرە،
دەرکێ ئەوان شانشینان، دوو دەریان، تاقان، پەنجەرە و هەڵبگێون[1]
تاکو چارەکە سەعاتێکی لێی بێتن، بۆنی عەتر و بخورێ
ئەگەر شەمس موقابڵ چرا دادەگیرسێنن

---

١- هەڵبگێون: بکەنەوە، دەرکە و پەنجەران ئاوەڵا بکەن، بیانخەنە سەر پشت.

له سێبارەتی[1] نووریٚ.

گەلی برادەرینە وە من[2] دەست لە بەژنی باریك و دوو چاوی بەلـەك هەڵناگرم

هەتا حەزرەتی ئیسرافیل نەداتن لە نەفخی سووریٚ

مەنسووری هەلاج تەقەی نەیەتن لە کەوانی

حەزرەتی مووسا هەزار و یەك کەلیمەی نەکاتن، لەگەڵ باری تەعالا

لەسەر کێوی تووریٚ

وەیلیٚ، سەحەرە...

***

ئەوەل سەحەرە، گەلی برادەرینە

ئەوڕۆکە جومعەیە لە محەلی نیوەڕۆیێ،

ئەگەر فەقێیان لە مەدرەسان دەخوینن

بولبولی خانەوێران بەجیٚ ناهێڵیٚ جیٚ ڕاوگەی خۆییٚ

وە من دەڵێم خۆزگە، دوو ڕاموسانم لە گەردنیٚ بە خاڵ و

دوو چاوی بەڵەك کردبایە، لە مابەینیٚ برژانگ و برۆییٚ

وەیلیٚ سەحەرە...

***

ئەوەل سەحەرە

گەلی برادەرینە، ئەمن ئەو ساڵەکە

---

١- سێبارەت: شەو وەکو پێوەری فۆلکلۆری سیٚ بەشە، شێوان، خەوتنان، نێوانیٚ خەوتنان و سەحەریٚ، هەر بەشێکیش لەو بەشانە پێی دەگوتریٚ (بەتڵ)، وەکو بە درەنگەشەوێکی دەگوتریٚ بەتلێکی شەو ماوە، یان دوو بەتلی شەو ڕۆیشتوون.

٢- وە من: وە + ئەمن، دەبڕینێکی کۆییانەی کۆنە و کوردانەیە.

سەبارەت[1] بە بەژنی باریك و دوو چاوی بەڵەك، بوویم سەرگەردانە
ئەگەر لە شاری مووسڵێ، لە بۆ من بێنەوە تیمە سەرقافڵە باشی،
لە شاری بەغدایێ، لە بۆ من بێنەوە تیمە بازرگانە.
گەڵی برادەرینە، ئەگەر سینگی ئەوێ بابانوێرانەی
لە بۆ من بمێنێ، بە وێ باخچەی گوڵان
ئەگەر لەبۆ خۆم بۆی، دەبم بە باخەوانە
وەیلێ سەحەرە...

***

ئەوەڵ سەحەرە
گەڵی برادەرینە، نیازی دڵی من وایە،
لانکێکی لە بۆ ئەسمەرێ خۆم بکەم، لە داری سەوڵی
لە بۆم بانگ کەنەوە وەستایەکی دوازدە عیلم[2]
دە با ئەو کراسی ئەو بابانوێرانەی، لەبۆ ئەسمەرێ من
بە قەدەر ببڕی[3]
ئەوە مەمکێ مەحبوبە گچکەلامەکەی من
زێدە گچکەنە، ناگەنە سەر زاری تفڵی
وەیلێ، سەحەرە...

***

ئەوەل سەحەرە

---

١- سەبارەت: خاتر، لەبەر، لەبەر خاتری تۆ.

٢- دوازدە عیلم: زاراوێکی کۆنی پلەکانی مەلایانەیە، بەڵام لێرەدا بە خوازە وەرگیراوە بۆ پیرۆزکردنێ کراسی سەحەرێ، مەلا کراوە بە بەرگدروو.

٣- قەدەر: بڕیار.

**گەلی برادەرینە، ئەو ساڵەکە نیازی دڵێ من وایە**

**کراسێکی بۆ ئەسمەرێ خۆم بکەم بە مسکینی[1]**

**ئەگەر سوورە گوڵ سوور دەبوون لە باغان،**

**ئەمن دوعایەکی دەکەم ئەنگۆ بڵێن ئامین:**

**هەر کەسانێکی ئەگەر دەبێتە باعیسی دوو دڵان**

**یا ڕەبی خێر و خۆشییە لە ماڵ و مەنزڵێ خۆی نەبینێ**

**ڕۆژی حەشرێ لەسەر بەردی سەخرەتوڵلا**

**ڕوو دەر نەباتن لەبەر شەیتانی لەعینی!**

**وەیلێ، سەحەرە...**

---

**١- بە مسکینی: بە بۆنی ئەم عەترە نایابەی کراسی سەحەر خانێ بۆندار دەکرێ، کە میسکی خەتایە و لەنێو نێوکی جۆرە ئاسکێکدا هەیە.**

## وه گەر شەمس موقابڵ چرا دادەگیرێسنن لە سێبارەتی شەوێدا:

هەر وەکو ڕێ و ڕێچکەی بۆچوون و لێکۆڵینەوە و وردبوونەوان، ڕووی خۆیان لەو دەربڕینەی دەکەن و بۆی دەچن، زۆر وێدەچێ ئەگەر ماڵێ بابی سەحەر خانێ، لە نێو شاری کۆیەی ئەو سەردەمەیدا، ڕووی لە خۆرهەڵاتێ بووبێ و، دوور یان نزیکیش، بەرابەری مزگەوتەکەی حاجی مەلا ئەسعەدی بابی فەقێ موحەممەدی بەهادینی ئاشقە گڕ گرتووەکەی سەحەرخانێ بوو بێ و، لەو ماڵەشدا ژووری نووستنێ سەحەرێ، لە نهۆمێ سەرێ و ڕووی پەنجەرەکەی بەرابەری ڕووباری کۆیە و مزگەوتی ناوبراو بوو بێ.

زۆریش وێدەچی ئەگەر سەحەر خانی سوور و سپی و چاوشین و برژانگ و برۆ ڕەش و باڵا بڵند و شلکە نەمام، شەوێ لەبەر سەرین لە باوەش گرتن و بەخۆوە گووشینێ و بڕوو پێ نەهاتنێ و لێکدانەوە و خەیاڵان، خەوی گەلێك درەنگ بەسەردا هەڵکشابێ و هەتا کاتێکی تێپەڕیوو، هەر لەگەڵ لێکدانەوە و بیر و بۆچوونان سەرە و بەرەی کردبن و دەستیان پێ لە یەکدی بەر نەدابێ جودا نەبووبنەوە، ئەوجار درەنگانێکی خەوێ بە لایدا خستبێ و سەری پێ وەسەر سەرینێ کردبێ و خەرمانێ گوڵان و ڕێحانان خەمڵیبێ و چرایەکەش هەر بیپوانیتێ و خۆی بۆ بسووتێنێ و بسووتێ.

وێستێ کات خۆرهەڵاتە و خۆر لە ئاسۆیان و سەرکەلانەوە، کەوتووەتە پرشنگ پەخشانکردنێ و چاو گێڕانێ بۆ دیتنێ دیمەنێ سروشتی ڕازاوە و جوان و جوانان. لە نێو شاری کۆیەش، لە ماڵێ بابی سەحەرێ لە پەنجەرێڕا، هەودا تیشکی خۆرێ بەسەر جەستەی

ناسك و نەرمی سەحەر خانێدا پەخشان كردوون، بەم كارەش سێ ڕووناكی لە ژووریٚ سەحەر خانێدا ڕووناكستانێكی گەلێك ڕووناكییان بەرپا كردووە، كە ئەو ڕووناكییانەش، بریتین لە ڕووناكییەتیشكی خۆریٚ و ڕووناكییە چرایەكەی و ڕووناكییە ڕووی، وەكو هەیڤی تابانیٚ سەحەریٚ، كە وەكو هاوكێشەش دەبێتە (ڕووناكی خۆریٚ + ڕووناكی چرایە + ڕووناكی ڕووی سەحەریٚ)، كە هەر سێك ڕووناكییەكەش پێكەوە، یەكسانن بە (سێبارەتی نووریٚ). گەردنیٚ سپی و بەرگەردنیٚ كراوە و بەلەكی خڕ و نەرم و لۆركی بەڵقیسایی و پانییەی هەنجیرە زەردەیش، كۆی ئەو ئەستێرانەن، كە لە دەوری سەحەریٚ نووستوو كۆ بوونەوە، هەر وەكو نالی دەڵیٚ:

ئەستێرە هەموو مەحوە لە نێو نووری قەمەردا؟
یا شەمسی جەماڵت شەوی گێڕاوە بە فەردا[1]!

جا گەلی خۆشەویستان، پێشینە گوتویانە: "قسە، قسەی دێنیٚ" لێرەشدا ئەمن پێم وایە ئەگەر مانگە بەجێماوەكەی سەفەری شەوێی شیعری گۆرانی مەزنەشاعیر، هۆی بەجێمانەكەی هەر ئەوە بووە، كە لە ئاسمانێرا و لە پەنجەرێوە ڕوخساری سپیی زیوینی كیژە سەحەرێی دیوە و لە هەوایەوە بەرابەری ڕاوەستاوە و بە سەیر و سەرسامییەوە تەماشای كردووە و چاوی سەرنجدانانی لەسەر هەڵنەگرتووە، كاتێكیش وە خۆی هاتۆتەوە، دەبینیٚ ئەوە لە سەفەری شەویٚ بەجێماوە و كەوتووەتە بەر ڕووناكاییە تیشكی كاتی زەردە سەر ئەنگێوان و، كەوان بە دەنگی قاسپە قاسپان لێیان كردووەتە

---

١- دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو.

هەرا هەرا، ئەویش لە شەرمان و لە ترسێ ئاشکرابوونێ، کەمتر جوانییەکەی بەراورد بە جوانییەتییە کیژە سەحەرێ، جا بە ناچاریی خۆی بزر کردووە، هەر بابەتێکی لەم جۆرە کارانەش بووە گۆرانی شاعیری هەژاندووە، کە ڕووداوەکە بشیعرێنێ و بڵێ:

مانگی بەجێماو لە سەفەری شەو
زەردە، لە ترسی قاسپە قاسپی کەو

فەقێ موحەممەد بەهادینیش، لە ئەوەڵ سەحەرێوە، دەست بە کتێب و چاو لەسەر پەنجەری ماڵێ بابی سەحەرێ هەتا درەنگ بووە، هەر ڕاوەستاوە و، لە کۆتادا لەگەڵ مانگە بەجێماوەکەی سەفەری شەوی ئاسمانێ، هەردووکیان بە هیوای دیداری شەوێکی دیکە و سەحەرێکی دی، دڵخۆشییە خۆیان داوەتەوە.

## سەحەر کێیە؟

هەر چەند جارێکی و لە هەر کات و شوێنێکی ئەگەر مەقامی سەحەرەی خاڵە سێوە گۆرانیبێژی کۆییم بە بەرگوێیاندا دەگوزەرێ، ئاواز و وشەکانی بە جووتە لەگەڵ هەست و هۆشماندا ئاوێتە دەبن، هێواش هێواش لە نێو خوێنماندا دەتوێنەوە، ئەو دەمەش هێزی ڕۆیشتنێم لە جوڵە دەکەوێ و ویستی گوێگرتنێم پتر و پتر هەڵدەکشێ و تامەزرۆتر دەبێ و ئەندێشەم دەمباتە نێو ئەو شارەی، کە زۆری مرۆڤی بەخشندە و زانای ئایینی و نووسەر و شاعیر و هونەرمەندی بوارە لە یەکدی جودایەکانی وەبەرهەم هێناون، هەر

لەبەر ئەوەشە هێمنی شاعیر بە نرخێکی بەرزەوە مافی ڕەوای داوەتە ئەو شارەی و باشی بۆ گۆتییە، کە گۆتیتی:

چلۆن بۆ سوورمە نابێ خاکی شارێک
کە حاجی پێی لەسەر دانابێ جارێک[1]

ئەگەر لەسەر هەر یەکێك لە مەزنە مرۆڤەکانی شاری کۆیە بدوێین و لە حاجی قادری شاعیرەوە دەست پێبکەین، دڵنیام لە باسە تایبەتییەکەی خۆمان زۆر وەدوور دەکەوینەوە و بە گران دەتوانین بگەڕێینەوە سەر ڕێیەکەمان، چونکە باسی گەلێك زۆر لەسەر ئەم شارە و مرۆڤە بەهرەمەندەکانییەوە نووسراون و گوتراون و گوتراون، جا لەبەر ئەوەی لێرەدا مەبەستە تایبەتییەکەی مە، بە تەنێ هۆی دروستبوونێ مەقامی (سەحەر)ی خاڵە سێوەی هونەرمەند و ناسینێ سەرحەرێ کیژە، جا لەبەر ئەوەی جارێ خۆمان لە بابەتی دیکەی ئەملا و ئەولای، لك و پۆپی باسەکەمان دەبوێرین و بە دەرفەتێکی دیکەیان دەسپێرین.

سەحەر، وەکو وشە، کۆمەڵێك مانا دەبەخشێ، بەڵام لەم باسەی بابەتەکەماندا سەحەر، ناوی ناسکۆڵە کیژێکی تازە سەرهەڵدەی گەشەکردووی جوانی خانەوادێکی خانەدانی ئایین مووسایی کۆیەیە، کە ئەو سەردەمەش خانەوادە مووساییەکان، لە سەجەمی کوردستانێدا خانەوادەی بەڕێزی ساماندراری بەناوبانگ بوون، ژیانیشیان لە شاری کۆیەدا، هەر وەکو هەموو شار و شوێنەکانی کوردستانێ، هەمیشە ژیانێکی ئاسایی و یەکدی خۆشەویستانە بووە، هەر وەکو خوالێخشبوو مەسعوودی مەلا موحەممەدی کۆیی لە کتێبی (حەماغای گەورە)دا گۆتیتی:

---

[1]- تاریك و روون، سەرچاوەی پێشوو.

"سێوە، خەڵکی هەرمۆتەی[1] بووە، واش بزانم ناوەکەی لە (صلێوە)وە هاتووە و بووە بە سێوە. لە پیرەژنەکانی کە ئاشناییان لەگەڵ ماڵی ئێمەدا هەبووە، بیستوومانە کچە جوولەکەیەکی کۆیی ناوی (سەحەر) بووە و زۆریش جوان بووە، کوڕێکی مەلا ئەسعەدی جەلیزادەش، ناوی (محەممەد بەهادین) بووە، فەقێیەکی لاوچاک و دەنگخۆش بووە، ئەو سەردەمەش بە عادەت ئافرەتان دەچوونە جلك شووشتن بۆ ڕووبار و ڕێگەشیان بە بەر مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەدیدا بووە، محەممەد بەهاش، شەیدای ئەو کیژە سەحەرەی بووە، لەو دەمانەشدا، کە سەحەر بۆ ئیشی خۆی هاتووەتە سەر ڕووبار، کاکە بەها دەوری دەرسەکانی وەها بە گەرمی کردووەتەوە و دەنگی لێ هەڵبڕیوە، کە خەڵقی گەڕەك هاتوون بۆ گوێ لێگرتنێی، دیارە هەر دەنگدانەوەی ئەو دەور و دەرسەی فەقێش بووە لەناو گۆرانییەکەدا هەیە و بەرهەمی ئەو عیشقەیە.

کاکە بەها بە گەنجی جوانەمەرگ بووە، بە لای کەمەوە ١٣٥ ساڵێك بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕیوە، چونکە بەها لە دەوری ١٢٥٠ی کۆچی هاتووەتە دنیاوە، لە ساڵی ١٢٧٠ی کۆچیشدا فەقێیەتی کردووە، ئەو دەرس و دەورەش، بنچینەی گۆرانییەکەیە.[2]

---

١- هەرمۆتە: گوندێکە دەکەوێتە خۆراوای شاری کۆیە، گوندێکی کۆن و گەورەیە، خاوەنی ڕەز و باخە زەیتوونە، دەشتی کشتوکاڵی هەیە، خەڵکەکەی پەیڕەوی ئایینی مەسیحی دەکەن و بە خۆشی و ئارامی لەگەڵ موسڵمانەکان لە هەموو دەڤەرەکەیدا، پێکەوە دەژین و مرۆڤانە ژیان دەگوزەرێنن.

٢- لێرەدا ڕوونکردنەوەکەی کاك مەسعوودی مەلا موحەممەدی کۆیی تەواو بووە، کە لە کتێبی (حەماغای گەورە)دا، باسی لێوە کردووە.

وەکو دیارە کتێبەکە، لە ساڵی ١٩٨٦ی زایینیدا بەرگی یەکەمی چاپ کراوە. جا بە گوێرەی گوتەی نووسەر و ساڵی بەرگی یەکەمی کتێبەکەش، ١٣٥ ساڵ بەسەر ڕووداوەکەیدا ڕابوردووە، جا بە لێدەرکردنی ١٣٥ لە ١٩٨٦، دەکاتە ساڵی ١٨٥١ز، ئەگەر موحەممەد بەهاش لە دەوری ساڵی ١٢٥٣ی کۆچیدا هاتبێتە دنیاوە، دیارە دەکاتە ساڵی (١٨٣٧ز).

بەم لێکدانەوەیەی ساڵانەش، وێدەچێ ڕووداوە ئەشقییەکە و گۆرانییەکە بگەڕێنەوە دەوروبەری ساڵی ١٨٥١ی زایینی، بە کەمێك بەرەو ژوور و بەرەو ژێرتر. دیارە ئەم ساڵانەش، نزیکە ژیانی حەماغای کۆیە بووە، کە سێوەی عیسایی باوەڕی هەرمۆتەیی، گەلێك جاران لە دیوەخانێ ئەم پیاوەیدا، گۆرانی گوتووە، ڕەنگە حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادەی بابی کاکە بەهاش، بە تەمەن هەر نزیکە تەمەنی حەماغای گەورە بووبێ.

ئەمن پێم وایە ئەم ئەشقە مەترسی ئەوەی لێ کراوە ئەگەر بە هۆی ئایینێوە، دوودڵی و بێ هیوایی زۆری چەکەرە تێدا کردبێ، ئەمەش بە گوێرەی ئەوەی، کە فەقێ بەها، پێناوێکی[1] وە دەست ناکەوێ، ئەگەر ڕاستی دڵی خۆی بۆ بە سەحەرە زێدە جوانێ بڵێ.

جا لەبەر ئەو هۆیەی، زۆر وێدەچی ئەگەر ئەو ئەشقە لە هەنگاوی سەرەتاییدا، ئەشقێکی تاك لایەنە بووبێ و لە دواتردا پەرەی سەندبێ، ئەوە لە لایەك و، لە لایەکی دیکەشەوە، زۆر لە گوینە سەحەر خانیش

---

١- پێناو: ئەو کەسەیە لە نێوانێ دوو ئاشقاندا کاری بۆ یەکدیبوونێ ساز دەکا، ئەمنیش لە بریی جووتەی ئاشقان سوپاسی پوورە پێناوێ و کارە پیرۆزەکەی دەکەم.

هەر لەو کات و ساتەیدا تووشی هەمان خورپە دڵی خۆشەویستییە بوون، بەڵام لەبەر قسە و قسەڵۆکان و لۆمەی بەد و بەدکاران و ڕێگرییە دوو جۆرە ئایینی لە یەکدی جودای فەقێی موسڵمان و کوڕە مەلا و، سەحەری کچە جوو، جار و بار گڕ و کڵپەی ئەشقی بۆ یەکدیبوونێی خامۆش کرابنەوە! هێندێك جارانیش وەکو ژیلەمۆی خۆڵەمێش لەسەرکەوتوو، شنە شێبای فێنك و هێمنی خەیاڵی نێوانێ شەوێ و ڕۆژێ، گەلێك جاران خۆشەویستییە بۆ یەکدیبوونێ گەش بووبێتەوە و ڕووناکاییە پێش چاوانی ڕوون کردبنەوە و، سەرینی پێ لە بن سەری خۆیان دەرهێنابن، بە سینگ و سینەی خۆیانیانەوە گوشیبن و لەگەڵیان کەوتبنە گەوزگەوزانێ و فەرامۆشییە نێو دڵ و جەستەی خۆیان، پێ دابین و ئارام و خۆش کردبن.

## سەحەر پیرۆزە:

ئەگەر لە هەموو لایەکیەوە بڕوانینە بەرجەستەیەتییە وشەی سەحرێ و سەرنجی ڕاست و دروستی ئاڕاستە بکەین و لێی بکۆڵینەوە، بێگومان بەرزی و پیرۆزی و لێوە درەوشاوە پەخشان بەدی دەکرێ. دیارە ئەم ئاکارە چاکانەش، بەری چاوان ڕوون و وردبینتر و دڵان دڵخۆشتر و گەشتر دەکا و بیری چاك و کاری باش و وتەی دروست و مرۆڤدۆستی و خۆشەویستییان، لە نێو بیر و هۆشاندا چەکەرە پێ دەکا و بەرنامەی چاکەکارییان و دوورکەوتنەوان لە خەراپەکارییان، پێشکێش و دابەش دەکات.

خوداوەندی میری مەزن، بەدیهێنەری هەموان و هەبوان لە قورئانێدا، بۆ سزادان و پاداشتی بەندە چاك و خەراپەکانی، زۆری باس لە کاتەکانی شەوان و ڕۆژان کردووە، لە نێو ئەم دوو کاتانەشدا چەند بەشێکیانی بۆ مەبەستی وەدەرخستن و سوێند پێ خواردنی هەڵبژاردووە، ئەم کاتە پیرۆزانەش وەکو کاتەکانی (عەسر)ی دوای نیوەڕۆیان و (سەحەر)ی نێوانێ لە یەکدی جودابوونەوێ تاریکاییە شەوان و ڕووناکاییە ڕۆژان، ئەمەش وەکو ئایەتەکانی:

"والمنفقين والمستغفرين بالأسحار".[1] بۆ وەدەرخستنی و پاداشتێ چاکەکاران. ئایەتی یەکەمی سوورەتی والفجر و ئایەتی چوارەمی "والليل اذا يسر – هەمان سوورەت، بۆ سزادانی بەندەی بەدکار.[2]

ئەوە بێجگە لەوەی کە لە زۆر شوێنی دیکەشدا، بە دروست و خوازەیش لە قورئانی پیرۆزدا چەند بارە بوونەوە. ئەوە لە لایەك و لە لایەکی دیکەشەوە، شاعیرانی کلاسیکی کورد، ئەم شەوە پیرۆزەیان لە نێو شیعرەکانیاندا، چاك و زۆر باس کردووە، بۆ نموونەی هەموان وەکو:

سەحەر مەستانە ڕابردم، بە بەر دەرکی کلێسایێ
کەچی دەستی دڵی گرتم، خەرامان بەچکە تەرسایێ[3]

وەك بلبلەکەی فەجری ئەزەل، وێردمە ئەی یار
بۆ ئەو گوڵەی خەڵقی ئەکا، حەمدی ئیلاهت[1]

---

١- سوورەتی آل عمران، ئایەتی ١٦.

٢- سوورەتی والفجر، ئایەتی ١ و٤.

٣- دیوانی وەفایی، سەرچاوەی پێشوو.

بــــه (والفجــــر)ی ڕوونـــاکی بـــن چـــینی زوڵـــف
کــه فەجرێکــه ســادق، بــه بــێ کیــزب و خولــف[2]

## سەحەر لە نێو باساندا:

نـــالی خەبـــەری بـــێ ئەســـەری غائیبـــە، ئـــەمما
نـــاڵێکی حـــەزین دێ، لـــە موناجــاتی ســـەحەردا[3]

هــەر وەکــو دیــارە وشــەی ســەحەر، وشــەیەکی عەرەببیــە و چــەند جۆرێك مانای جودای هەیە، مانایەکیش لەو مانایانەی، کە ئەوەنده بە زۆری لە نێو کوردەواری لە گوتن و گۆیاندا بەکارهاتووە، وشەی ســەحەرێیە، کــە لــە نــاوی کاتــەوە هــاتووە و نــاوی مرۆڤــی لێــوە وەرگیراوە، وەکو ئەم ناوە مرۆڤەی، کە ئێمە لێرەدا دەمانەوێ باسی لێوە بکەین و کەمۆکە تروسکاییەکەیشی بەسەردا پەخش بکەین، کە ئەم وشە عەرەبییەش وەکو وشەیەکی ڕەسەنی زمانی کوردی، لە نێو کۆمەڵی وشە کوردییەکاندا، ڕێزی پیرۆزی هەبووە و خۆشەویستانە گوتن و گۆی پێکراوە و کوردێندراوە.

لە نێو قورئانێشدا ئەم وشە وەکو دروست و خوازە، خودا بەکاری هێناوە، کە لە ڕووداوێکدا بە موحەممەدی پەیامبەر (د.خ) دەفەرمووێ: بە نەیارانت بڵێ ئەمن بە پشتیوانی ئەو خودایەی، خۆم دەپارێزم کە

---

١- دیوانی گۆران، سەرچاوەی پێشوو.

٢- دیوانی مەحوی، سەرچاوەی پێشوو.

٣- دیوانی نالی، سەرچاوەی پێشوو.

تاریکییـه و ڕووناکییـه لـه یەکدی جـودا دەکاتـەوە[1]، واتـا ئـەو خودایـەی ئەگـەر سـەحەریّ دێنێـتە کایـەوە و تاریکییـە دەگـۆڕێ بە ڕووناکییـە، بـۆ چالاکییەکانی کـاری مرۆڤـان و هـەموان و هـەبوان. شـاعیرانی کلاسـیکی کـوردیش، هـەر لـەم ڕوانگـەوە، ئـەم وشـەیان بـە هـەردووك شـێوەکانی دروست و خوازە بەکار هێناوە و بە ڕوونی دەدرەوشێتەوە.

سـەحەر وەکو کات، دوا کۆتـایی تاریکییـە شـەوێیە و سـەرەتای وەدەر کـەوتنیّ ڕووناکییـە ڕۆژێیـە. بێگومـان سـەحەری باسـەکەشمان، بـە نـاوی ئەو کاتـە پـیرۆزەی لـە یەکدی جودابوونـەویّ تـاریکی و ڕووناکییـان، یـان شەو و ڕۆژانەوە، ناوەکـەی پـیرۆز کراوە، وەکو دیـارە ئـەو کاتـەش لە نێـو سـەرجەم مرۆڤانـدا پـیرۆزە و کـاتی بێداربوونـەوە و چالاکیی کـاری ژیانـیّ کۆمەڵایەتی و بەکارهێنانی هۆش و بیری حەسـاوەی شـەوانە و سـەرەتای کار و کردەوەی پیرۆزی پێشکەوتنیّ ژیانێیە.

هـەر لـەو کاتەشـدا لـە نێـو کـوردەواری، وەکـو ئـاییـنی ئیسـلام، پێشڕەوانی ئاییـنیّ، بـە هـۆی دەنگـی بـانگی هۆشیاربوونەویّ (خـودا مەزنترینــە)وە، ئــەم کاتــەیان هــەر لــە ســەرەتای ئیســلامەوە هــەتا ئێستێش، یەکەمجار لە پێنج جارە باوەکان، لە سەحەرێدا بە کەسانی موسـڵمان بــاوەڕ، ڕاگەیەنــدراوە. فەقێیــەکانیش، هــەر لەبــەر ئــەم پشووسـازی و حەسـاوییەوە لـە مزگەوتەکانیانـدا، ئـەم کاتـە مێشـك و جەسـتە ئاسـوودەیان، بـۆ دەرەوکردنـەویّ وانـەکانیان هەڵبـژاردووە و

---

١- قل اعوذ برب الفلق. سوورەتی الفلق، ئایەتی ١. فەلەقیش بە مانـای لـە یەکدی جوداکردنـەویّ دوو شـتان دێـت، کـە لێـرەدا مەبەسـت لـە یەکـدی جوداکردنـەویّ شەویّ و ڕۆژێیە، کە وەکو بابەتەکەمان بە مانـای سـەحەر دێـت، یـان سـەرکەوتنیّ تێگەیشتنێیە، بەسەر ناتێنەگەیشتنێدا.

فەرامۆشیان نەکردووە و، زۆرتری کارەکانی خۆیان لە کاتەکانی دیکەی ڕۆژێدا، ئەنجام داوە.

مەلا نالی شاعیریش، بزربوون و نادیارییە خۆی، لە نێو کۆمەڵی دواکەوتووی کوردەواریدا، لە شەوی تاریکی خەماوییدا، لە دیاریدانی ڕووناکاییە سەحەرێدا، بە ناڵەناڵی زەبوونییەوە و کڕووزانەوە و پاڕانەوێ، لەبەر دەرکەی خودای خۆیدا، خۆی دەبینێتەوە و توانای بەهرەی هونەریەتییە زۆر و بەرزی خۆی، بۆ سەرجەم کەسانی کورد وە دەردەخا، هەتا تێ بگەن، کە نالی لە لای بیرڕووناکان، هەمیشە هەر دیارە و درەوشاوەیە:

نالی خەبەری بێ ئەسەری غائیبە، ئەمما
ناڵێکی حەزین دێ، لە مونجاتی سەحەردا

لەم تاکە شیعرەیدا، دیارە لە نێو کۆمەڵگایەکەیدا، نالی زۆر نادیارە، کە پەردەی ڕەشی تێنەگەیشتوویی، تێکڕای مێشکی خەڵکەکەی داپۆشیوە و هیچ کەسێك، نالی وەکو ڕۆشنبیر ناناسێ و کەم و زۆر لە شیعرەکانیشی تێناگەن، بەڵام شێبای هەڵکردووی ڕەوتی پێشکەوتن و تێگەیشتنێ هۆشیاربوونەوێ، ئەو پەردە ڕەشە کۆنە چڵکنەی، هەڵداوەتەوە و ڕایفڕاندووە بۆ نێو گۆڕی نەمانێ، جا لەو سەحەر پڕ شکۆییە پیرۆزەیدا، مێشکی تێگەیشتن و بیری قوڵ و فراوانی دەریای نالی شاعیر، دەکەوێتە هاژە هاژێ و شڵپەی شەپۆل بە دوای شەپۆلاندا خۆی دەنوێنێ، جا ئەوجار بیری ڕاست و دروستی نالیی سەرنج بەکێش، دەدرەوشێتەوە.

خودا لە قورئانێدا دەربارەی ئەو مرۆڤە چاکەکارانەی خۆی، کە لە سەحەرێدا، هەموو ڕۆژان لە سەرەتای ڕووناکی ڕۆژێدا بڕیاری چاکەکردنی ئەو ڕۆژەی دەدەن، ڕێزی زۆری بۆ داناون، کە فەرموویەتی:

"كَانُوا قَلِيلاً مِّنَ اللَّيْلِ مَا يَهْجَعُونَ وَبِالأسْحَارِ هُمْ يَسْتَغْفِرُونَ"[1]، بە مانای، ئەو کەسە چاکەکارانەی لە شەوێدا بە کەمی دەنوون و لە بەیانیانیشدا، لە کاتی لە یەکدی جودابوونەوی ڕەشاییە شەوی و سپیایی ڕۆژێدا (سەحەر)، هەر کەسێکیان داوای لێبوردنی گوناهان لە خوای گەورەی خۆی دەکا و، هەر کەسێکیان بۆ بەدیهێنانی کاری پێویستی خۆی، هەڵدەستی و سەحەریش، هێواش و لەسەرەخۆ وەدەردەکەوی و دەرکەی تاریکاییە پێوە دەدا و دەرکەی ڕووناکاییە دەکاتەوە و دەیخاتە سەر پشتی و بە سەرجەم مرۆڤ و گیانلەبەران دەڵێ (ڕۆژتان باش) و هیوای خۆشیان و چاکەکردنێتان بۆ لە خودای دەخوازم.

ئەمن پێم وایە وەفایی شاعیر لە شیعرەکانیدا، لە زۆربەی شاعیرە کلاسیکییەکانی دی، زۆر پتر باسی سەحەرێی کردووە، هەر لەبەر ئەوەش لێرەدا بە جوان و گونجاوم زانی، ئەگەر دوو شیعری هاوتەبای باسەکەمانی ئەم شاعیرەمان، لە نێو باخە سەحەرەکانیدا، گوڵبژێرکەم و وەکو نموونەی جوانییان بهێنمە سەر مێزی پێش دیتەی خوێنەرانی باسی سەحەری و سەحەرخانی:

---

١- سوورەتی والذاریات، ئایەتەکانی ١٧ و ١٨.

وا دەگریـــەم بـــە زەلیلـــی لـــە غـــەمی گـــەردنی تـــۆ
ئـــاگری خســـتە دڵـــم، ناڵـــەیی مـــورغی ســـەحەری[1]

ئەی خۆشخەبەر، نەسیمی سەحەر، پەیکی عاشقان
دەمێکی هەستە پێ، قوربان، جەماڵت عالەم ئاراکە[2]

دەربـارەی پیرۆزییـەکانی وشـەی سـەحەرێ بـوو، بیرمەنـدان و هۆشـیاران و تێگەیشـتوان، ئەوەنـدە بەسـیەتی، کـە خـودای مـەزن لـە قورئانێـدا لـە زۆر شـوێنی لـە یەکـدی جـودادا، سـوێندی بـەم کاتـەی خواردووە، وەکو:

"والفجر و الليل اذا يسر" يان "والصبح اذا تنفس"[3].

ئازیزان، ئەگەر وەفایی شاعیر و، سەحەری کیژە مووساییزادە، لە یەك دەقەر و یەك تەمەندا بان، ئەم شیعرە پڕ هۆش و هەستانە، هەر لە بەژن و بـاڵای سـەحەرێ باسـەکەمان، جـوان و لێوەشـاوە دەبـوون. لـە لایـەکی دیکەشـەوە، زۆر لـە گوینـە، کـە سەرچـاوەی ئـەم شـیعرە ناخییـە دەروونییانەش، هەر سەحەرێکی دیکەی شێوە سەحەرەکەی لەمەڕ خۆمان بووبێت و وەفایی خستبێتە سەر ئەم گەوهەرە شیعر پەخشانەی!!

جـا خوێنـەری خۆشەویسـت، نـاوی سـەحەری کیژۆڵـە ناسـك و نازدارەکـەشمان، پوختـەی لـە بێژینگـدراوی کـۆی ئـەم هـەموو تـاریکی و ڕەشـاییەی شـەوێیە، کـە بـیر و بۆچـوونێ شـیعرەکەی نـالی شـاعیریش،

---

١- دیوانی وەفایی، سەرچاوەی پێشوو.

٢- دیوانی وەفایی، سەرچاوەی پێشوو.

٣- سوورەتی و الفجر، ئایەتی ١.

بێگومان هەر یەکدیگرتەی فەرموودەکەی مەزنی مەزنانە و، دەشگونجێ ئەگەر بۆچوون و لێکدانەوەی دیکەش لەم ڕووەوە گەلێك هەبن.

زۆریش ڕەوا و بابەتیانەیە، ئەگەر کاکە بەهای فەقێی مەلازادەش، لەگەڵ سەحەرێ سپێدەی لە نێوانێ شەوێ و هاتنێ ڕۆژێدا، لەبەر هەیوانێ مزگەوتەکەی بابیدا، بە دەم هاتن و چوونێوە، کتێبە بەدەست و چاو لەسەر ڕێیە وەدەرکەوتنێ، سەحەرە نازدارێ نێو بیر و هۆشانی، پێیدا هەڵگوتبێ و کچە سەحەری شۆخ و نازەنینیشی لە کاتی سەحەرێدا، وە پێی دەورکردنەوێ وانەکەی ئەو ڕۆژەی خستبێ، هەروەها هەموو ڕۆژەکانی دیکەش، هەر ئەم کردارەی چەند بارە کردبێتەوە و دەنگی لێ بڵند کردبێ و بیگوتبێ: "ئەوەل، سەحەرە..." بە مانای یەکەمجار سەحەری کیژ و لە دوایەشدا، وانەکانم!

## ئامینێ، لە تۆ دینێ من دینێ- ئامینێ، بە هەردووکمان سەرینێ[1]:

لە نێوەرۆکی ئەو شیعرەیدا، وەدەردەکەوێ، کە ئامینێ کیژە کوردە و موسڵمانە، کورە دڵخوازەکەشی کوردە و ناموسڵمانە. جا لەسەر هەر ئایینێکی دیکە بووبێ، کوڕەکە داوای هاوسەرگیرییە لە کچەکەی دەکا. لەم ڕووەشەوە پێویستە ئێمەش بۆچوون و قسەی خۆمان هەبێ، هەر وەکو دەڵێین:

ئەگەر ئێمەی مرۆڤ، بە گوێرەی لە بابادەم و داکەحەوامانەوە، هاتبینە جیهانێ بوونێ ژیانێوە، یان وەکو تیۆری داروینییەتییە، لە هەر جۆرە ئاژەڵێکییەوە پەیدا بووبین و بۆ بە مرۆڤبوونی هەبوونێ، گۆڕانکاریمان بەسەردا هاتبێ، دیارە ئەگەر وەکو مرۆڤ هەموومان بە بێ جودایی، زادەی یەك تاکە سەرچاوەین، لەم دوو سەرچاوانە و بە گۆڕانکاریی سروشتی و هەمیشەیی هەبوون و شوێن و کاتانیش، هەر زۆر و زۆرتر بووین و هەر هەمووشمان وەکو یەکدی پەرەمان گرتووە و لە یەکتریش جودا بووینەوە و بەملا و لایاندا بڵاوەمان کردووە.

وەکو دەبیندرێ بۆ لەیەکدی گەیشتنێ، پێویستییە ژیانێ هەر پارچەیەك لەم پارچانە، جۆرە زمانێکی هێناوەتە کایەوە و کار و پێویستییە نێو کۆمەڵێی پێ ڕاهیی کردوون و بە هۆی هەمەجۆریە ئاو و هەوای شوێنە جوداکانیش، ڕەنگی مرۆڤان تایبەتمەندییە سروشتییەکانی خۆی وەرگرتووە. بەڵام بێجگە لەم جوداییکردە

---

١- سەرچاوە: فۆلکلۆر.

سروشتییە جوگرافییانەش، دیارە هەر هەموومان مرۆڤین و پێکهاتەی جەستەییشمان هەر وەکو یەکدییە، یان لە یەکدییەوە زۆر نزیکە. خۆ ئەگەر کەمە جوداییەکیش هەبێت بێگومان بە هۆی ڕەنگی پێست و ڕوخساری دەرێیە، هەر وەکو مۆدێرنە ماشێنێکی یەك کارگەی، کە تەنیا بۆیەی دیوی دەرێیان لە یەکدییان جودا دەکاتەوە، هەر وەکو دیاریشە لە کاتی پارچە گۆڕینێدا هەموویان پارچەیان بۆ یەکدی دەگونجێن.

بێگومان مرۆڤەکانیش لەم ئەفرۆدانییەتییەی، بەدەر نییە. بێجگە لەوەی کە ماشێنەکان دەستکردی مرۆڤانن و مرۆڤەکانیش دەستکردی کردگاری مەزنن، لێرەشدا بە ڕوونی دەردەکەوێ، کە مرۆڤ هەر مرۆڤە، بەڵام وەکو لە کۆنەوە بووەتە باو، ئەگەر نێر و مێیەکی مرۆڤان، هەرتك یەك ئایینی نەبن، ئەوە کاری هاوسەرگیرییەتی لە نێوانیاندا کارێکی نەشیاوی نادروستە. لێرەدا دەپرسین: ئەگەر دوو هاوسەر هەر یەکەیان لەسەر ئایینێکی لە یەکدی جودابێ، ئەوە خەراپییەك و ناڕەوایەتییەکەی چییە و لە چیدایە، ئەگەر ببن بە هاوسەری یەکدی؟!

گۆرانیبێژێکی دیکەش دەڵێ:

هەر کەسە بەردینێ خۆ
تو یارا منی حەنێ![1]

دیارە ئەم باوەڕەی، کە لەم گۆرانییەدا سەری هەڵداوە، خاوەن شیعر و خاوەن گۆرانی، بە ڕەوا و دروست و گونجاوی دەزانن. ئەمەش دیارە لێکدانەوەی ئەوەی بۆ کراوە، کە هەر یەکێکیان پارچێکی کوشندەی وەکو گونچیلکەی لە دەست بدا، ئەوەی دیکەیان

---

[1] - سەرچاوە: فۆلکلۆر.

بە پێشکێشکردنی گونچیلکەیەکی خۆی، ڕزگاری دەکا و درێژە بە گیانی بەختەوەرییەکەیان دەدەن.

گوتمان هەمووماں مرۆڤین و لە یەك سەرچاوەوە هاتووینە نێو ژیانەوە و لە یەکەمەوە زۆر و زۆرتر بووین و بەم هۆیەشەوە لە یەکدی دوورکەوتنەوە ڕووی داوە، لە ئەنجامی ئەم دوورکەوتنەوەش، بە پێی یاسای سروشتی گەشەکردن و پێشکەوتنی، لە هەر پارچە کۆمەڵگایەکیدا، کەسانێکی وریا و تێگەیشتوو، هاتوونە نێو کایەکانی ژیانێوە، بۆ ڕێکخستنی کاری کۆمەڵەکەیان، یاسا و ڕێسای تایبەتیشیان داناوە و لەم کارەشیاندا بۆچوون و بیر و نەریتی لە یەکدی جودا پەیدا بوون، هەر کەسێکیش لەو کەسانە بوون بە ڕابەر و پێشەوا و بڕیاردەری کۆمەڵەکانی خۆیان و پێکەوە گونجان و نەگونجانی ژیانی نێوانی هاوسەرگیرییە خەڵکەکەیان پێك هێناوە، بڕیارەکەشیان جێگیر کراوە و بە درێژایی مێژووی کۆن و نوێ هەتا ئێستێش برەوی هەیە.

ڕێگە پێنەدانی هاوسەرگیرییە دوو ئاشقی مرۆڤی نێر و مێی ئایین لە یەکدی جودا، بووە بە کۆسپ بۆ یەکدی نەبوونی زۆر جۆر لە ئاشقانی وەکو موحەممەد بەهادینی موحەممەدی و سەحەر خانی مووسایی، زۆریش وێدەچێ، کە ئەم باوەڕەش کاری گەلێك خەراپی وەکو لە یەکدی ترازانی خێزانیی و ڕووداوی ناخۆشی لێ بکەوێتەوە.

وەکو لە کتێبی (حەماغای گەورە)دا باسی لێوە کراوە، کاکە بەها بە گەنجی مردووە، بەڵام هیچ جۆرە تروسکە ڕووناکییەك لەسەر چارەنووس و ژیانی سەحەر خانێدا دیار نییە و وەگیر نەکەوتووە.

له لێکۆڵینەوە و سەرنج لێدانانیدا، بۆمان وەدەردەکەوێ ئەگەر زۆر کەسان لە دێر زەمانەوە لە دژی ئەم جوداکارییانە، بۆچوونێ لە یەکدی جودایان لەسەر ئەم بیروباوەڕە هەبووبێ! هەر وەکو شاعیری عەرەب (ئەبو عەلای مەعەری) لە شیعرێکیدا بەرابەر بە کەسانی هەوادارانی ئەم جوداکارییانە دەڵێ:

إنما هذه المذاهب أسبابلجذبالدنيا إلى الرؤساء[1]

هەر وەکو دەبیندرێ لێرە و لە باسەکەماندا دیارە، کە ئەم شیعرە هەر لایەنێك لە لایەنەکان دەگرێتەوە، بەڵام لە بارەی لایەنەکانی دیکەوە، هەر لەم جۆرە کەسە بیرمەندانە هەن، هەر وەکو عەلی بەردەشانی شاعیر چاکی بیر لەو باوەڕەی کردۆتەوە:

ئەگەر بەدکار لێ بگەڕێ
گورگ لەگەڵ پیرەمەڕێ
پێکەوە دەچنە لەوەڕێ
گەر بیگاتێ تێدەپەڕێ
چیی پێ ناڵێ، لێی دەگەڕێ
بە خۆشی ژین، دەگوزەرێ[2].

هەر وەکو لە درێژەی باسەکەماندا دەبینین، کوڕێکی موسڵمانی فەقێی مەلازادە، لەگەڵ کچێکی جوولەکەی مووسایی، دڵیان بۆ یەکدی بووەتە کانگای خۆشەویستنێ، خاڵە سێوەی عیسایی

---

١- دیوانی عومەر خەییام، سەرچاوەی پێشوو.

٢- دیوانی عەلی بەردەشانی، کرکردنەوە و لێکدانەوەی زیاد مەحەمەدەمین، چاپی دووەم، ئنستیتیوتی کەلەپووری کورد، سلێمانی، ٢٠١٥.

هونەرمەندیش، گەلێکی بە پیرۆز و ڕەوا زانیوە و دروستویستانە مرۆڤایەتییەکەی، هاتووەتە کەف و کوڵێ و بە ناوی سەحەرێوە و بە دەنگە داودییەکەی، بە سۆزەوە و بە ئاوازی ڕەسەنی کوردی، مەقامی ئەشقی هەمیشە زیندووی پێدا هەڵگوتوون، کە پاشی چەند ساڵان ئێستێ سەری ڕەزامەندییە و فەرامۆشیانی بۆ وەکو لکە شۆڕەبیی بەر شنەی شێبای سەحەرێ، ڕادەژێنین!

گەلۆ، پێویستە ئەوەش بزانین، کە گۆرانی (ئەوەل سەحەرە)ی خاڵەی، بە ڕووداوەکەیەوە، تایبەتە بە شاری کۆیەوە و لە پێش خاڵە سێوەشدا، کەسی دیکە ئەم مەقامەی نەخوێندووە، ئەگەر کەسێکیش گوتبێتی، یان بیڵێ، دیارە بە ڕووداوەکەی و بە وشە و ئاوازیشەوە، بەرهەمی ئەشقی فەقێ موحەممەدی موحەممەدی و و کیژە سەحەر خانێ مووسایی و خاڵە سێوەی هونەرمەندی عیسابیە و تایبەتە بە شاری کۆیەوە.

لە کۆتاییدا دەڵێین: ئەم یادگارە مرۆڤانە دروستە، هەر گەشاوە و پتر و پتر پەرەگرتوو بێ.

## ئیشکەرم بمرێ، بەڵام مشوورخۆرم نەمرێ:

ئـەم پەنـدەی سەرباسـەکەمان، پەنـدێکی فۆلکلـۆری ڕەسـەنی پێشـینەی کوردانـە، هـەر وەکـو دیاریشـە وێدەچـێ کـە لـە ئـەنجام و ئـەزموونێ کـارکردن و پەرەپێـدانێ کـارە پیشـەییە هەمیشـەییەکانی ژیانـێ کشـتوکاڵی و ئاژەڵدارییەتییـە ئـەو سـەردەمەی نێـو کۆمەڵگـەی کوردەوارییـە، لـە ئـەنجامی ڕوودانـی چـیرۆکێکی دیـاردا، سـەرهەڵدە بووبـێ و لەبـەر هـۆی پەسـەندیانی، لـە بێـژینگ درابـێ و خـاوێن کرابێتەوە و تـەنیا کاکڵە پوختەکەی مابێتـەوە، ئـەویش بۆ پێویستی پێبوونێ گوزەراندنێ ژیانێ لە نێو کۆمـەڵێ خەڵکیـدا، وەکو تیـورێکی چاک کـەڵکی لـێ وەرگیرابـێ و زۆر کار و کـردەی لـە جێـی پێویسـت و شیاودا بە باشی پێ بە ئەنجام گەیەندرابێ.

هـەر وەکو لێرەدا وەدەر دەکـەوێ، ئـەم پەنـدە لـە نێـو دوو کارەکتـەری گرنگ و پێویستی ڕەوتی ژیانێدا، مرۆڤی دەخاتە هەڵبژاردەی یەکێکیان.

دیارە وەکو خۆرسکی گشتی، کارکردن هـۆی بنچینەی ژیانێیە و بێگومانە ئەگـەر کارکردن نـەبێ، ژیـان ڕادەوەستی و کۆتـایی پـێ دێ، بـەڵام دیاریشـە ئەگـەر بەرهـەمی وەبـەرهاتووی کارکردنـێ، وەکـو پێویست ڕێزی لێ نەگیرێ و وەکو دروست زیرەکانە و وریایانە بەکار نەهێنـدرێت، بێگومـان ئەگـەر چاکیش و زۆریـش بـێ، دیـارە هـەر بـە هەدەر دەڕوا و کەمترین سوودی لێ وەردەگیرێ و لـە ئـەنجامی هـەموو ئـەم بـێ مشـوورییانەش، ژیـان بـە دواکـەوتوویی و چەرمەسـەری دەگـوزەرێ، بـەڵام بـە پێچـەوانەوە، وەکـو کـاردار کـارێ دەکـات،

مشوورخۆریش بە دڵسۆزییەوە کاری خۆی وەکو دروست بە ئەنجام بگەیەنێ، دیارە بەرهەمی ڕەنجی کارکردنی بە فیڕۆ ناچێ و دەبێتە هۆی گرنگی پێشکەوتنێ و کۆڵەکەی بەهێزی ڕاگرتنێ بەختەوەرییە سەرجەمی لایەنەکانی خۆشگوزەراندنێ.

لێرەدا باسە سەرەکەییەکەمان، خاڵە سێوەی هونەرمەند و گۆرانییە مەقامە سەحەرە پڕ سۆزە خۆشەکە و چەند گۆرانییەکی تۆمارکراوی دیکەیەتی. دیارە بە گوێرەی پەیوەندی مشوورخۆرییە و گونجاوییە پێویستە لەو بارە و باسەماندا، حەسەن زیرەکی بولبولی ئاوازخوانی نێو باخ و گوڵزاری ناڵەشکێنەی بۆکانێ، لەم مشوورخۆرییەیدا وەکو وەفا بۆ مشوورخۆرییە کۆییان، بە بڵندەوە وەدەر بخرێ.

خوالێخۆشبوان، هونەرمەندان، دیارە هەردووکیان وەکو جەستە لە ئارادا نەماون، بەڵام مشوورخۆران: کاکە زیاد و مام جەلال تاڵەبانی، هەردووکیش کۆیی بە خۆ بە لێپرسراوییەوە نەیانهێشتووە دەنگی ئەو دوو هەونەرمەندانە، وەکو دەنگی داودی ئاسنگەر و[1] زۆرانی دیکە، لە نێو بۆشایی ئاسمانێدا بزر ببێ.

---

١- یەکێك لە تایبەتمەندییەکانی داود پێغەمبەر، دەنگی خۆش بووە، لە چاپی یەکەمی دیوانی عومەری خەییام، گۆڕینی لە فارسییەوە بۆ کوردی، شێخ سەلام، لە لاپەڕە ١٤٢ کە دەڵێ:

بێ بادە مەبە، موڵکی موحمموودە
گوێ بگرە لە چەنگ لەرەی داودە
لە هاتن لە چوون ئەندێشە مەکە
کەیف بکە ئێستە، ئێستە مەوجوودە.

کاکە زیاد و مام جەلال، هەر یەکێکیان لە دوو سەردەمی جودا لە یەکدی، بەڵام نزیك لە کات لە یەکتر، ئەم دوو هونەرمەندانەیان گەیاندۆتە ئێستگەی ڕادیۆی کوردی بەغدایە و کاری پێویستیان بۆ فەراهەم هێناون.

خوالێخۆشبوو مەسعوودی مەلا موحەممەدی کۆیی دەڵی: "کاکە زیاد سێوەی لە تەمەنی پیری هێنایە بەغدایە و ئەم چەند گۆرانییەی پێ پڕ کردەوە.[1]"

کەریم شارەزاش هەر لەو بارەوە ئەو کاتەمان بۆ دیاری دەکا و دەڵێ: "لە ساڵی ١٩٥٢ی زایینی، سێوە پێنج مەقامی لە ئێستگەی ڕادیۆی کوردی بڵاو کردەوە، کە ئەمانەن: سەحەر، گوڵێ، ئایشەگوڵ، بەهار، شەنگ مێرەم.[2]"

هەر لەم بارەوە، وەکو زاندراوە، مام جەلال تاڵەبانییش لە بەغدایە و هەر لەو ساڵانەدا، حەسەن زیرەکی لە وتێلێکی دیوە و گوێی لە دەنگی ڕاگرتووە، هەر ئەو دەمەش لەگەڵ خۆیدا بردوویەتییە ئێستگەی هەمان ڕادیۆی کوردی و بە لێپرسراوانی ئێستگەکەی ئاشنا کردووە و کاری پێویستی بۆ بە ئەنجام گەیاندووە.

وەکو گوتمان هەردوو هونەرمەند، کۆچی دواییان کردووە، بەڵام بە هۆی مشوورخۆرانەوە، ئەوەتا ئێستێ ئەمەی گوێگر، بە چاوی

---

١- حەماغای گەورە، مەسعوود موحەممەد، لە بڵاوکراوەکانی دەزگای ڕۆشنبیری بڵاوکردنەوەی کوردی، چاپی یەکەم، چ(سومر)، بەغدا، ١٩٨٦.

٢- مەقامەکانی سێوەی هونەرمەند لە تەرازووی ڕەسەنایەتیدا، کەریم شارەزا، لە بڵاوکراوەکانی ئەمینداریێتیی گشتیی ڕۆشنبیری و لاوان، چاپی یەکەم، چ(حوسام)، بەغدا، ١٩٨٢.

خەیاڵ، شێوەی جەستەیان وەکو نەمر دەبینین و، بە هۆی دەنگ و ئاوازەکانیشیانەوە، هەواری پڕ خامۆشی گوێیانمان، ئاوەدان دەبنەوە و سەری فەرامۆشیانمان پێ ڕادەژێنن.

لە کۆتایی ئەم باسەدا دەڵێین: هەر نەمر و گەشاوە بن هونەرمەند و هونەردۆست و مشوورخۆر، لە کۆیە و کوردستانێدا.

# پاشبار

کاغەز دەنووسم بۆ لەیلیٚ، بە دڵێکی پڕ لە خوێنەوە
دەنگی قوڵینگان دیٚ لە هەوای، دەڵێن کوێستانچین، دێنەوە

ئێستیٚ تایبەتمەندییەکانی وەرزی هاوینیٚ، ڕۆژ لە دوای ڕۆژیٚ بەرەو کاڵتر بوونەویٚ وەدەر دەکەون و ڕۆژگار کەوتوونە تەمەن کورتهێنانیٚ، سەرەتای وەرزی پاییزیٚ هەستی پیٚ دەکریٚ و پەیتا پەیتا و بیٚ پسانەوە و پشوودان، تایبەتمەندییەکانی هاوینیٚ بە پاڵەپەستۆ، وەپێش خۆی دەدا و بەرەو هەڵدێرانیان دەڵدەدێریٚ، ئەستێرەی گەلاوێژیٚ مژدەهێنیٚ کەمبوونەویٚ گەرمای هاوینیٚ، لەسەر کەل و ئاسۆیان، لە نێوانیٚ شەو و ڕۆژێدا، کەوتۆتە سەراسوێکردنیٚ و شەو لە دوای شەوێش، زووتر و گەشتر و ورشەدارتر، پرشنگ پەخشانیٚ دەداتەوە و بەرابەری گوڵوکە جووتێرە خۆشەویستەکەی دڵداری نێو دڵی خۆی، دەکەوێتە ناز و نمایشکردنیٚ.

کزە بای مەیلەو ساردی سپێدەی کوێستانیٚ، کەڵکی نووستنیٚ دەرێی لە منداڵ و پیران بڕیوە و جێی پیٚ گواستوونەوە بۆ نێو ژووریٚ ڕەشماڵ و بن کەپران، ئاویٚ کانیان و جۆگە و گۆم و ڕووباران، لەبەر ساردیانیان بۆ سپێدە خۆ تێهەڵکێشانی جەستان، وە تەزین و، لێوان وە لەرزین و ددانان وە چەقچۆ و تەقەتەق دێنن.

مەڕدار کەوتوونە مشوورخواردنیٚ خۆ خڕکردنەویٚ و بەرهەم و وەسەر یەکدینانیٚ، پێستە پەنیریان لە کونە پێستان ڕاکێشاونە دەریٚ و تێکڕای بەرهەمانیان، بەرەو شاران ڕەوانە کردوون، بازاڕیان

ئاوەدان کردوونەوە و دووکان و دووکاندارانیان بە فرۆشتن و کڕینان، بە جووڵە جووڵ و بێنە و بەرە هێناون.

گەلۆ، وێستێ کەپر و تاوڵ تێك دراون، و لە پاییزە هەواری نێوانێ گەرمێن و کوێستانێ، تێکڕا هەڵیانداونەوە و دەوروبەریان ڕازاندوونەوە و مەڕدار نزیکە شار بوونەوە، مێگەلیش لە نێو خەزەڵە پەرێزاندا تێر و تەسەلن.

باڵدار کوێستانیان لێ چۆڵ بوون، بە دوای ماڵ و ماڵاتیدا هاتنە خوارێ، باز لەسەر بڵندە بەردی بڵند هەبوون، دەسەڵاتی خۆیان لە نوێ نیشاندایەوە، قولێنگێ گەردن گۆزەڵ، لە نێو پێدەشتان و لەسەر جێ خەرمانە هەڵگیراوان، لە نێو تیکە قەڵشتوان و چەوەڵ و نەرمە وردەکایەدا، بە دوای دەنکە گەنمە بەجێماوێ بن خەرمانێدا دەگەڕێن، پەپووسلێمانکە لە نێو مێرگی بە وردە چیمەنی پاییزێدا، لە ڕۆخ ڕووبار و جۆگە و دەراواندا، مێرگا و مێرگ دەفڕێ و دەنیشێتەوە و بە شانازییەوە تاجەکەی سەری خۆی بڵاو دەکاتەوە و، گەلێك جارانیش وەکۆی دەهێنێتەوە و چەند بارەی دەکاتەوە.

ئێستێ مەڕدار، سەرجەمی پارەی فرۆشتنێ بەرهەمانیان، وەگیر کەوتۆتەوە و گوند و ماڵ ئاوەدان بوونەوە. کوڕ و کیژ، پەیمان بەستنێ بەهارێ ڕابوردوویان، وەبیر هاتوونەوە و هاوجووتی و هاوسەری یەك سەرینییە دوو سەران، بە مافی ڕەوای خۆیان دەزانن و، کەوتوونە نامە بۆ یەکدی ناردنێ و، ئاگادارکردنەوە و چاو پێك کەوتنەوان و ڕاز و گلەیی و یەکتر دواندنێ و باس و خواسی خوازبێنی کردنێ.

جا ئەوجار ئەی خوێنەری خۆشەویست و گەنجی شۆخ، ئەتۆش فەرموو (پاییزێ وەرە سابلاغێ بۆ نێو گەڕی دیلانێ) و دەستی سەرچۆپییە شاییە چەپەیی بگرە و خۆت بەملاولایاندا هەڵسووڕێنە و دەسرۆکەی ڕەنگینی دەستت ڕاوەشێنە و کەمێك ڕووت بۆ لای چەپ وەربگێڕە، بە چرپە بە دۆیە[1] ناسکۆڵە شلکەکەی دەستت بڵێ:

لەبەر ئەو زوڵفەت دەمرم، لە هەنیەت دەگرێ مانێ!

جا خوێنەری خۆشەویستی جوان و جوانپەرست، ئێستێ لێرە و لە کوێی ئەم باسە نایابانەدا، بۆت ڕوون دەبێتەوە، ئەگەر کەلتوور و فۆلکلۆری کوردان، چەندە باخێکی پان و بەرین و فراوان و زەنوێر و پڕ گوڵ و گوڵزاری کێشکردووی سەدان ئاوازخوێنی جۆرەها جۆر ئاوازی لە یەکدی جودای وەکو نێو ئەم کتێبەی و گەلێك پتر و پتریش هەن.

گەلۆ، دە با ئەمەش سەرچاوەی ئاوێ لێ بڕدراوی فەرامۆشکراوی زیندەگییە، بۆ ئەم گوڵزارە کەموێنانە، هەڵبەستینەوە و پاراویان بکەینەوە، ئەوجار هەر وەکو ئەسیری شاعیر دەڵێ، ئەتۆش:

هەڵسە گەشتی چیمەن و گوڵزاری کوردستان بکە

---

[1]- دۆ: لە کوردەوارییەدا، بە ئافرەتی نێو شاییە ڕەشبەڵەکێ دەگوترێ (دۆ)، ئەگەر لە شاییەکەیدا ئافرەت نەبوو، یان کەم بوو، گۆرانیبێژی شاییەکەی بە دەنگی بڵند هاوار دەکا و دەڵێ: "هەی دۆ، هەی دۆ!" ئەم وشە لە بنەچەدا لەگەڵ وشەی (دۆتە)ی ئینگلیزی لە سەرچاوێکییەوە جودا بوونەوە، چونکە لە زمانی ئینگلیزیدا وشەکە بە مانای کچ دێت و پیتەکەی وای وشەکەش (gh) ناخوێندرێتەوە Doughter... پەندە کوردییە پێشینانەکەش لە داخوازییە هاوسەرگیرییەدا، ئامۆژگاریمان دەکا و دەڵێ: داکێ ببینە و دۆتێ بخوازە.

گەر لەبۆ دەردی دەروونت، داوودەرمانت دەوێ[1]

جا دیمەنی سروشتی خۆڕسك و لەرەی سێوی سەر سینەی ناز و نازداری نێو شاییە، چاوانت ڕوون دەکاتەوە و دەردی دەروونێت و تێکڕای دەردەکانت پەڕاگەندە دەکات.

---

١- دیوانی ئەسیری، ئامادە کردن و پێشەکی د.کوردستان موکریانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، ٢٠٠٦، هەولێر.

## مـن:

* زیاد محەممەد ئەمین.
* لە ساڵی ١٩٣٨ لە ناحیەی بنگردی دەڤەری مەرگەی، وەدەرنراومە نێـو دەشـتی پـان و بـەرینی بـە چـقڵ و چـاڵی ئـەم ژیانـە بـە کوێرەوەرییەوە.
* خوێندنی سەرەتاییم لە زێدی لەدایکبونێم تەواو کردووە. ناوەندی و خانەی مامۆستایانی سەرەتاییەش، لە سلێمانی.
* سـاڵی ١٩٦١ بـە مامۆسـتا دامـەزرام و لـەم شـوێنانە کـاری مامۆستایەتیم بە ئەنجام گەیاندووە: گوندی کانیتوو- بنگرد، قەڵادزێ، عەمارە، سلێمانی، هەولێر و ڕانیە.
* لە دوای ژیانی داسەپێندراوی ٦٨ ساڵەی تەمەنم، لە ساڵی ٢٠٠٦ خانەنشـین کـرام، لـەوەش بـە دواوە هـەلم بـۆ کـاری وێـژەیی و کەلەپوور و فۆلکلۆر، بۆ فەراهەم هات و هەتا ئێستێ، بەم کتێبەوە، ١٠ کتێبێکی فۆلکلۆری و لێکۆڵینەوەم لەو بوارەدا، پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کردووە.

زیاد موحەمەد ئەمین ٢٠١٧/١/٢٦

ڕانیە